# من و زارا



نووسینی: سەعید کاوە

٢٠٠٩ی زایینی ١٣٨٨ی هەتاوی
سوئێد

# مــن و زارا

چاپی یەکەم نەورۆزی ١٣٨٨ی هەتاوی
مارسی ٢٠٠٩ی زاینی



ژمارەی کتێبخانەی ڕەسمی سوئێد
٩٧٨-٩١-٦٣٣-٤٠٧٣-٤

نووسین و ئامادەکردن
سەعید کاوە (کوێستانی)

**پێشکەشە بە جگەرگۆشەکانی من و زارا،**
**شێواو، شیرین، موراد، ئازاد و فەرهاد**

# پێش بار

ئێوارەیەکی سەیر بوو. تەلەفونم کرد و وتم پێم خۆشە بێم سەرێکت بدەم. بە خۆشییەکەوە کە لە دەنگیدا دیار بوو، دڵنیای خۆی دەربڕی. چووم و لە دەرگام دا، کردیەوە و بەخێرهاتنی کردم چووینە ژوورەوە و دانیشتین. هەم چاکی دەناسم و هەمیشیش لە وانەیە زۆر باشی نەناسم. دەیناسم و دەزانم کێیە. ساڵەها لە شۆڕشی کوردستاندا هاوسەنگەر بووین. پێشمەرگەیەکی کۆن و شۆڕشگێڕێکی بەباوەڕی بۆ ئەم لاولایە.

دیارە وەکوو ئەو زۆرن، بەڵام شتێکی تایبەتی، یان هەستێکی شاراوەی نادیار هەیە کە ئەو بۆ من لە خەڵکی دی یان باشترە بڵێم لە خەڵکێکی زۆری دیکە جیا دەکاتەوە. خۆ من زۆر جارم دیوە و چات و چۆیم کردووە و لە دەرەوەی ماڵ و لە لۆنە و کۆبوونەوەی جۆراوجۆردا پێکەوە دانیشتووین و، جاری واش بووە ڕووبەڕووی یەکتر بووینەوە و قۆچ و سەرانی قسە و لێدوانمان، ئامبازی یەکتریش بوون!

بەڵام ئەم ئێوارەیە و ئەم چوون و سەردانەی من لەو حاڵەتەی ئەو تایبەتییە. ئاخر دوای لە دەسچوونی هاوسەرەکەی لە چەند مانگ لەمەوبەرەوە، ئاوا لە نزیکەوە دەرفەت نەبوو بیبینم و باسی لەگەڵ بکەم.

دوو گوڵم هێناوە، دوو ڕۆزی زەرد و سوور. لە بیرمە لە سەردەمی مێرمنداڵییەوە زۆرم دەبیستەوە کە گوڵی سوور ڕەمز و سەمبولی ئەوین و، گوڵی زەردیش نیشانەی بێ وەفاییە! گوڵەکانم لە کاغەز گرتنەوە و بە دەم چاک و خۆشەوە وتم ئەو دوو گوڵانە لۆ هەر دوکتانە، هەم تۆ، هەم دادە زارا. هێشتا زارم لە وتنی زارا نەبوو بووەوە کە دیتم زاری بەنەمی و پڕمەی گریانێکی بێ دەنگ، گوڵەکانی لە دەستم دا پێ نەماند. گوتم ڕۆزی سوور نیشانەی ئەوینە، ئەوینی تۆ، جا ئەگەر دادە زارا بێ وەفایی کردوە و بە جێی هێشتووی، ئەم ڕۆزە

زەردەش بە یادی ئەو لە گوڵدان دادەنێین. دیتم نەخێر، ئەم پیاوە بە ساڵاچووەی سارد و
گەرمی ڕۆژگار چێشتووەی، پەند و گوڵمەز دیتووەی، خاوەن چەندین کچ و کوڕ و نەوەیە،
نەوری فرمێسکی، لەرە و لەرزی هەستە بریندارەکەی مێشی هێنایە جۆش و، پرمەشی
بە گریانی من دا و ئاوی بە چاوی غروورم دا هێنایە خوار ...
دەستی پێکرد و دەردی دڵی کرد. زارای دەمانە و زارای لاواند و زاری نواند. دەتگوت لاوێکی
تازە ئاشقی بێ دەرەتانی وڵاتی کوردە، کە یارەکەی تازە پەیدا کردوە، بەڵام پێش ئەوەی
تێربێ لە چێژوانی، بای بەڵاو سێڵاوی بێ هەرا، لە گوندی یاری داوە و ئۆگرەکەی
ئەمی ڕفاندوە و، لێ قەوماوی و دڵشکاوی بەم سەکاندوە.
گوتی و گریاو گریاندمی. تێیش دەگەیشتم و نەدەگەیشتم. دەشمزانی و نەمدەزانی. ئەشتی وام
نەدیبوو، ساڕی وام نەزانیبوو، چیرۆکی وام نەبیستبوو. پیاوێکی وەک ئەو بە باوەڕ و
ڕابردوو، فرمێسکی لە چاو نابڕێتەوە. لای کەم لە کەسێکی وەکو ئەوم چاوەڕوان نەدەکرد.
جا ئەو جار باوەڕم پێتەوتر بوو کە لە بۆچوون و تێگەیشتنی خۆم بەرامبەر بە گەورەژنی کریسالووی
ماڵ و حاڵەکەی ئەو، هەڵەم نەکردوە و ئەو خاتوونە بەڕێزە کە ئێستاش دەنگی بەخێرهێنانەکانی و
وشە و قسە دڵتەشانەکانی لە گوێم دا دەزرینگێنەوە، بەڕاستی خاوەنی فرمێسک و دەرد و
ناڵەکانی سەعید کوێستانی یە. زانیم کە ئەم هەست ئێشان و بێ تاقەتی و بە یاییەی
کاک سەعید لە دووری گراویەکەی، کە بە درێژایی نیوسەدە پێکەوە لە گەرم و سارد و
هەرەس و کەوت و خۆشی و ناخۆشی دا هەڵیان کردوە، بۆ کەسێکە، بۆ ژنێکە،
کە وێنەی کەم بوە ...
گۆران وتەنی، سەعات فریو شە و درەنگ بوو، بەڵام ئاهەنگی تاسەی زارا تا دەهات
ئاهەنگین تر و خەم هێنەرتر دەبوو. مورادی کوڕیشیان کە لامان بوو، جار بە جار هەوڵی
دەدا لە ژێر تەئسیری ئەو دادو بێدادو قسە گۆڕینەوانەی من و بابی دەرچێ و ڕێگا بە

هاتنە ناواری فەرهەنگەکانی نەدا ، بەڵام ئەویش هەر وەک ئێمە دەرۆستی ئەوە نەدەهات .
کاک سەعید ئەو ئێوارەیە بیرەوەریی زۆری بۆ گێڕامەوە . سەروبنی هەموو ڕستە و چیرۆکەکانیشی
هەر زارا بوو . لە کاتی وادا مرۆڤ پێی خۆشە دڵنەواکەر و سووکنە دەر بێ ؛ پێی خۆشە
بتوانێ کوڵ وکۆی ئەو تاسە و لە دەستچوونە تا ڕادەیەک دامرکێنێ و هاودەردیی خۆی بنوێنێ .
من هەر ئەوەندەم لە دەست هات پێشنیار بکەم بۆ ئەوەی ئەم بارەگرانە کەمێک سووکتر ببێ ،
وەرە کاک سەعید بیرەوەرییەکانی خۆت کە لەگەڵ زارای خۆت هەتبوو ، بنووسەوە و بە
یادگاری بەجێی بێڵە . بنووسە کە زارای تۆ وەک گراوی و دەزگیران و هاوسەر و هاوڕێ و
دایک و دڵسۆز و هاوڕاز ، چۆن بوو و چۆن هاتوو و چۆن چوو ...
برێک ترمان قسە کرد و کەمێک تر گریاین و پاشان بەجێم هێشت .
زۆری پێ نەچوو ڕۆژێک مووراد پەیدا بوو ، وەک هێمنی دەڵێ ، کۆنە تەوراتێکی بۆ هێنام و
گوتی ئەوە بابم بۆی ناردووی و پێی خۆشە چاوی پێدا بخشێنی . پرسیم چییە ، وتی ئەوە
پێشنیارەکەی تۆیە و نووسیویەتی . لای خۆم وتم هەیهوو ، دەزانی چیرۆکی ئەم خانزادە کوردە
نابڕێتەوە و زارا هەر خۆی زارایە ...
خوێندمەوە و پێی دا چوومەوە و شتی زیاترم لە خاڵ و مانێی ئەم خانمە هاتە بەرچاو . کاک سەعید
سەرەڕای ئەوە کە لە باسکردن و لادانەوە و بیرهێنانەوەی هاوسەرەکەی دا نەیتوانیوە لە
سیاسەت و چوارچێوەی ڕووداوە سیاسییەکان خۆی لادا و تەنیا باسی زارای خۆی بکا و ،
ماوەیەکی باشی پێدەچێ هەتا خوێنەرەوە لە بیروباسی سیاسی و حیزبایەتیی کاک سەعید دەبێتەوە و
دەگاتە سەر چیرۆکی خۆی و زارا ، بەڵام بە دڵێکی پاک و گیانێکی ئازایانە و هەستێکی
ئەوینداوی ڕاستەوە ، باسی گەورەیی و تێگەیشتوویی و وەفاداری و ڕێز و حورمەتی کیژێکی
زادەی کوردستان دەکا ، کە بە درێژایی دەیان ساڵ ، لە سەختترین و هەستەمترین

کات و ساتەکانی ژیانی راونان و شەڕ و ئاوارەیی و دەرد و بێبەشیدا، هاوسەر و هاوشان و دڵسۆز و پشتیوانی ئەم بووە، بۆ سەعیدێکی گیرۆدەی ئەوینی ئەو و پێشمەرگەی عەبدالی کوردستان، بووە بە ماڵ و حاڵ و لە کەمالات و لەخۆبوردن را، دادی داوە و بووەتە نموونەی وەفا و ئەوین و ئازایەتیی و هەزار وەسف و نەخشاندنی دیش، کە بەرلە دۆزینەوەی عاجز و قەڵەم لە نووسینەوەی چارەزە.

پێم وایە کاک سەعید کوێستانی بە نووسینی «من و زارا» چیرۆکی ئەوینێکی تۆمار کردووە کە لە هیچ باو لۆران و سەخت وکەند و گوڕگەزا و تۆف و ئاگرێک نەپرینگاوەتەوە، زارای دڵگر و هاوسەر و دایکی ئەم چیرۆکە، بیری بە گوڵخەندەرانەکانی ئەفسانەی کۆن دێنێتەوە بیر، کە بە بوونیان، دنیا رووناک و دڵگەل پاک و کردەکان چاکن؛ بە نەبوون و لەدەستچوونیشیان، لۆن وبەرامبەری رووناکیی و پاکیی و چاکیی ئەوان، باخچەی دڵی هەموو ژیانێکی پڕلە ئەوین و وەفا و فیداکاریی، دەڕازێنێتەوە ...

بێهرۆز کوردەچەم

٢٠/٨/٢٠٠٨



ئێرە دەریای هەیدەرئابادە، دوو لاوی بەیەک گەیشتووی دڵ بە دنیا خۆش وەک سەیرانێکی هاوینی لە ڕۆژی جومعەدا لە شار وەدەرکەوتووین و لەسەر بەردێکی بڵندی قەراخ دەریا دانیشتووین و چاومان لە شەپۆلەکان بڕیوە.

## چەند وشەیەك

هەموو شتێك بەپێی تێپەڕ کردنی دەورو زەمان کۆن دەبێ‌و وەك خۆی نامێنێ. بوونەوەرێکی وەکوو مرۆڤیش بێجگە لەوەی پیردەبێ و ئاڵوو گۆڕی بەسەرداد‌ێ، تەنانەت ئەو بەسەرهات و ڕووداوانەی کە لە ژیانیدا دیتوویەو بەسەری هاتووە هێندێکیان فەرامۆش دەکا. بەتایبەتی کاتێك مرۆڤ نەدامەتیەکی بەسەردا دێ، ئەو کات گرفت دوو چەندان خۆی دەنوێنێ.
منیش بە هۆی خەسارەتێکی سروشتی کە وێم کەوتووە، واتە لە دەست دانی هاوڕێیەکی پەنجا ساڵەی ژیانم کە هەموو ژیانی خۆی لە پێناو ئامانج‌و بیروباوەری هاوڕێیەتی من دا فیدا کرد و بە بەشداری کردنی لە چالاکی‌و هەڵسووڕانی خەباتی شێلگیری نەتەوایەتی، زیاترلە چل و پێنج ساڵ پشتگرو پشتیوانم بووە، زەربەیەکی قورسترم وێکەوتووە.
دیارە هەر ئەوەندەم بۆکراوە بە کەموکووڕی چەند لاپەڕەیەك لە سەر ژیانی هاوسەریی و پێکەوە ژیانی دەربەدەریی و دەست و پەنجە نەرم کردن لە نێو ئەو خەم‌و هەژاریەی لەگەڵی چێژتووم، بێنمە سەر کاغەزو لەژێر نێوی "من و زارا" دا بیان نووسم. بەڵام ئەوەی ڕاستی بێ نەمتوانیوە سەد لە یەکیش سەبارەت بەو ئەمەگانەی زارا بە منی نیشان داوە، بیان نووسم.
هەرچەند لە چوار بەرگی سێسەدو چەند لاپەڕەیی‌دا لە سەر خۆم و ڕووداوەکانی کوردستان‌و کورد، هێندێکم نووسیوە، بەڵام زۆر بە کەمی چوومەتە نێو بواری خێزانیی. بەداخەوە بەهۆی فەرهەنگی کۆمەڵگا ئەو بوارە تائێستا نەڕەخساوە لەسەر زارای هاوسەرم بنووسم. دیارە لە کوردەواری ئەو تەلەسمە نەشکاوە کە پیاوێکی کورد لانیکەم هێندێك لە ژیانی پڕ لە قارەمانەتیی خێزانی بێنێتە سەر کاغەز. لە کوردەواریدا ژنی زۆر هەڵسوورو

قارەمانمان بووە، بەڵام عەیبە عەیبەی کۆمەڵگا بۆتە پێشگیر لە باس و نووسینی خێزانیی. هیوادارم بەو چەند لاپەڕەی کەمن لە ژێر ناوی "من و زارا" لەسەر هاوسەرم نووسیومە، ئەو ڕەچەیە بشکێ و لەمەودوا بە هۆی ئەمەگ ناسیی، هونەرو کرداری باش و کوێرەوەریو دەربەدەری وێگڕایی... مرۆڤ بتوانێ لەسەر هاوسەری شەریکە ژیانی خۆی بنووسێ. بێشك پێداگریی لە پەرە پێدانێکی ئاواو نووسینو هێنانە سەر کاغەز بەشێوەیەکی ڕێك و پێك، پێم وایە کەلێنێکی چووك لە کتێبخانەی کوردی پڕ دەکاتەوە.

بەسەرهاتی ژیانی ڕابردووی من و زارا کە پڕە لە تاڵی و سوێریو خۆشیو ناخۆشی، بە نووسینی ئەو چەند وشانە کە باسم لەو هەڵات هەڵاتو شاخو کێوو دۆڵ و دەرەو ژیانی ئەشکەوت و نوستن لەبن چادرو دیتنی گەرماو سەرما کردوە، مستێك لە خەڵوارە، کەچی "تەقڵەکوت" بە چەند لاپەرە نووسینی پەڕتووکەکەم بەستووە. ئەوەش هۆی بە تەمەن دا چوونو نەمانی حەوسەلەیە کە مرۆڤ ناچار دەکا هەرچی دەیکا کورت بیبڕێتەوە، چونکە لە گەڵ پیریی و کزیی سۆمای چاو هێچ ناکرێ، هەروەکوو لە شێعری هەڵۆدا هاتووە:

داخەکەم بۆ گوڕ و تینی جوانیم
ئەودەمەی چۆن و چ بووم، بۆ وانیم
هێزو سۆمای نیە باڵ و چاوم
ماومەوە گردەنشین، بێ ڕاوم

خۆزیا و سەت خۆزیا، سۆمای چاوەکانم ڕێگەی دابام ئەو شتانەی بەسەرمان هاتووە لەوە زیاتر لە بەسەرهاتی "من و زارا"دا هاتبایە سەر کاغەز تا بۆ هەموو کەس ڕوون بباوەو زانرابایە کە تەمەنی پڕ لە تاڵییو سوێریی و نەهامەتیی من و زارا چۆن بووە و چمان کێشاوە.

کاتێك باس لە سەردەمی لاویەتی خۆمو زارا دەکەم، هەر داوەرێك ئەگەر بێت و لەگەڵ سەردەمی لاوێکی مامناونجی هەڵیسەنگێنیّ، دەبینیّ چ زوڵمێکی سەنگینمان لەگەڵ کراوە. دیارە ئەو زوڵم و ستەمە زۆرە و دەگەڕێتەوە سەردەسەڵاتداری داگیرکەری کوردستان. بەڵام نابێ ئەوەش نادیدە بگرین کە خەڵکانی کۆمەڵگای خۆمانیش لەو ستەمەدا بەشدارن کە دەستەوستان و بێلایەن دانیشتوون و خۆیان کردووە بە تەماشاچی ئەو کەسانەی کە لەسەر کوردایەتیی ئاوارە و دەربەدەرن. هیوادارم بزانن تەماشاچی بوون، بە مانای گرینگی نەدان بە دەست بەسەر داگیرکراویی نیشتمانەکەمانە. لەکۆمەلگادا کەسانی دیکەی ئاوارەو خەباتکاریش هەن، بەڵام بەبیرێکی دیکە بۆئازادی هەوڵ دەدەن و ئەرکی نەتەوایەتیی زۆربەکەم دەگرن. وەك شاعیر لە نێو هەڵبەستەکانیدا دەڵێ:

ڕەنگن، هەموو زەردو سوورو شینن
کــوردایەتیی زۆر بەکـــەم دەبینن

کەسانی دیکەش هەن لەدژی منو کەسانی وەك من چەکی دوژمن هەڵدەگرن و خوێنی براو هاونیشتمانی خۆیان دەڕێژن. هەروەها کەسانێکیش هەن بە سیخوڕیی لەسەر ئازادیخوازان دەبن بە دەستکێشی دوژمنانی داگیرکەر و چاڵ بۆ هاونیشتمانانی خۆیان هەڵدەکەنن.

دەی جا هەتا ئاوا بەشبەش بین، نیشتمانەکەشمان ئاوا بەش بەش کراو و دەست بەسەرداگیراو بەژێردەستیی دەمێنینەوە. بێشك هەربۆیەشە کە هەزاران ژن و پیاوی وەکوو من و زاراش بەنانی وشك سەردەنێنەوەو بەجلی دڕاوی پینە کراو لە دەربەدەری و ئاوارەییدا تەمەنی لاویەتی تێدەپەڕێنن، یان ڕۆژێ لە بن بەردێ، دوژمن کۆتایی بەژیانیان دێنێ.

وەك پێشتر ئاماژەم پێکرد؛ کەم کاریی لە بێتوانایییە و دەردی دڵ کۆتایی نایەو هەروەکوو "دەبەگلە" درێژەی دەبێ.
باشتر وایە لێرە کۆتایی بە دەردی دڵ بێنم و بچینە سەر ئەو چەند وشانەی باسم کرد و نووسراون.

لە کۆتاییدا زۆر سوپاسی کاك بێهروز کوردئەحمەدی دەکەم کە لە پێداچوونەوەی کتێبەکەدا زەحمەتی کێشاوە و یارمەتی داوم و هەروەها بە دەستخەتی خۆی لە ژێر ناوی پێشبار پێشەکیی بۆ نووسیوە.

هەروەها سوپاسی جگەرگۆشەکانم، "موراد" و "ئازاد" دەکەم کە بە لێزانیی و ئەرکێکی زۆر، وردەکاریی و پاک و چاک کردنەوە و، بە کورتی ڕاست کردنەوەی فەننی و تەکنیکیی ئەو کتێبەیان وەستۆی خۆیان گرت و دەریان چواند و لە گێرەو کێشەیان ڕاپەڕاند.

سەعید کاوە (کوێستانی)
سوئێد، نەورۆزی ١٣٨٨ی هەتاویی، ٢٠٠٩ی زایینی



ئەم وێنەی زارا بە شێوەیەک هەڵگیراوە، کە حیکایەت لە
شێعری "شیرین تەشی دەڕێسێ" دەکا

# من و زارا

وەرزی ساڵ نێوان بەهارو هاوینە. ماڵمان لەگوندی خەلیفەلیانی سندوسە. تەمەنم لە دەوری پێنج ساڵی دایە. لەو تەمەنەدا مرۆڤ زۆر هەست بە چاکەو خراپە ناکات، بەڵام کەسانی بێبەزەو تووڕەو تۆسنو گرژو مۆنو، هەروەها زار بە پێکەنینو ڕووخۆش، لە مێشکیدا دەچەسپێتو لەبیری دەمێنێ. خەلیفەلیان یەکێك لەو دێخۆشانەی ناوچەی سندوسە.

سەردەم و کات ساڵی ١٣٢٤ی هەتاوییە و دەوران و سەروبەندی دامەزرانی کۆماری میللی دێموکڕاتی کوردستانە. کەسێك لە لاوەکانی مەهابادی هاتووەو ئێواران لاوەکان کۆ دەکاتەوەو لە دوای یەکتریان ڕیز دەکاو مەشقیان پێدەکات. کەس نایناسێو دەنگۆیە دەڵێن دەوڵەتی کوردی ئەو لاوە ڕاهێنەرەی ناردوە لاوەکان ڕابێنێ. ڕۆژانە بە گوفتو لوفتێکی شیرن لە نێو دێ ڕیزیان دەکاو دوای ئەوەی هەرا دەکا *ئامادە*، بەژماردنی ١،٢،٣،٤ هەنگاو بە لاوان داوێو ئەوانیش بەدڵی خۆش دەڕۆنو تەپو تۆز لەنێو دێدا ساز دەکەن.

ئێمەش منداڵی چوار پێنج ساڵە وەدوایان دەکەوتین بە ١،٢،٣،٤ لاسامان دەکردنەوەو خۆمان فێر دەکرد. لاوەی ڕاهێنەر دەهاتە پشتەوە بەئێمەشی دەگوت کە چۆن لاقمان لەگەڵ ئەوان ڕاست بکەین. کاتێك دەهاتمەوە ماڵێ دایکم زۆری پێخۆشبوو هانی دەدام هەموو ڕۆژێ بچم بۆ مەشقکردن و هەوڵ بدەم فێربم. دایکم دەیگوت بۆیەم پێخۆشە فێر بی، چونکە پایزێ ماڵمان دەچێتە نەغەدەو تۆ دەنێرمە قوتابخانە. هێندم پێخۆشبوو ماوەیەکی زۆر هەموو ڕۆژێ دووسێ جارم لە دایکم دەپرسی کەنگێ ماڵمان دەڕوا بۆ نەغەدە؟ ئەوەندەم لێپرسیبوو، دایکم لە وەڵامدانەوە وەڕەز کردبوو. وام گوشار بۆ هێنابوو جاروباردەیگوت شۆخیم کرد

مالْمان نارِوا. ئەو جار منیش پرسیارەکانم گۆڕیبوو، دەمپرسی دایە گیان بۆچی پەشیمان بوویە؟ بۆ قوتابخانەم نانێری؟ بۆ مالْمان ناچێتە شاری نەغەدە؟

دایکم دەستی لە ملم دەکردو دەیگوت وەلْلاهی ڕۆلْە پەشیمان نیم، بەلاّم تۆ تەنگت پێهەلْچنیوم ئەوەندەم لێدەپرسی وەڕەزت کردوم لە داخان وا دەلْێم.

کە دایکم دەستی لەملم دەکردو ماچی دەکردم و دەیگوت پەشیمان نیم هەردەچینە نەغەدە، من ئێستا دەزانم زگی پێم دەسووتا بۆیە دەستی لە ملی دەکردمو ماچی دەکردم کە خەم نەخۆم. ئیتر من ئەو جار لە ترسی ئەوەی نەوەکوو دایکم وەڕەزبێ و پەشیمان بێتەوە نەم دەپرسی.

ئایشێی خوشکم کە لەمن گەورەتر بوو پێمدەکوت لەدایکم بپرسێ کەنگێ مالْمان دەڕوا بۆ شار؟

هەموو ڕۆژانی پێنج شەممە لە شارۆچکەی مەحمەدیار بازارێك هەبوو تائێوارێ کڕینو فرۆشتنی تێدا دەکرا. ئێمە دوومانگامان هەبوو ئەگەر بارمان کردبا بۆ شاری نەغەدە دەبوایە بیانفرۆشین. دایکم بەیانیەك زوو منی لەو خەوە خۆشە هەستاندو گوتی هەستە دەچینە بازار مانگاکان دەفرۆشینو دێینەوە مالْەکەمان باردەکەین. وەختابوو لەخۆشیان خەنی بم. گورج هەستام خۆم ئامادە کردو مانگاکانمان وەپێش خۆماندا، چووینە بازارو دایکم مانگاکانی فرۆشت. لە گەڕانەوەدا لە ڕێگا لە دایکم پرسی ئەرێ دایە گیان بەڕاستیت بوو گوتت مانگاکان بفرۆشین مالْ باردەکەین؟ لە وەلاّمدا گوتی ئەرێ وەلْلا ڕۆلْە لەسبەینێ زووتر نییە باردەکەین.

دلْم زۆر خۆشبوو، شەوێ لە خۆشیان هەرجینگلْم دەدا. بەیانی مام قەیتەرانی جیرانمان کوێخای دێ بوو، کەلْ و عارەبەی هێنا مالْەکەمانی بۆ بار کردین و سوار بووین چووینە نەغەدە.

لە حەسارێك كەلوپەلی ماڵمان بەتاڵكرد. دیاربوو دایكم ئەو ماڵەی دەناسی. پێیان دەگوتن ماڵی مام برایم دزەیی. مام برایم بۆخۆی قاچاغ بوو هەڵاتبوو، دەیان گوت ناوبراو قۆڵسووری كۆمار بووەو لە ترسی عەجەمان هەڵاتووە ئێستا لەعێراقە. دوو كوڕی هەبوو بەنێوی قادرو ئەییوب. نێوی دایكیان "دەوڵەت" بوو.

پوور دەوڵەت ڕەفیقی دایكم بوو. خانوێكی چكۆڵەی سێوچواریان لە حەوشەكەیدا بوو، خاوێنمان كردەوەو مانگێ بە بیستو پێنج قران بەكرێمان گرتو دامەزراین. چوارپێج ساڵ لەوخانوە چووكە دا بووین. ئێمە سێ كەس بووین، منو دایكمو ئایشێ خوشكم. لەگەڵ ماڵی مام برایم زۆر یەكماڵەكیی پێكەوە ڕامان دەبوارد.

نەغەدە شارێكی چكۆڵەی ئەوپەڕی سێ سەت چوار سەت ماڵ دەبوو. بریتی بوو لە سێ گەڕەك و سەرقەڵا. واتە گەڕەكی عەجەمان، گەڕەكی كوردان، گەڕەكی جوولەكان. هێندێكیشی ماڵە هەرمەنی لێبوو ئەوانیش لە نێوان گەڕەكی كوردانو عەجەمان بوون.

دوای تێكچوونی كۆماری كوردستان هەرمەنیەكان باریان كردو ڕۆییشتن بۆ ئێرەوانی ئەرمەنستان. جووەكانیش گەڕانەوە بۆ ئیسڕایل. تەنیا دووسێ ماڵە جوولەكە تا ڕووخانی حكومەتی حەمەڕەزاشا لە نەغەدە مابوون. ماڵی برایم دەباغی، ماڵی یوسفی خمچی و كوڕەكانی.

ئێمە كە هاتینە نەغەدە، ئەو شارە لە ئیختیاری دەوڵەتی كوردیدا بوو. پێشەوا، سەید ئەحمەدی بە نێوی سەدری كوردستان لەنەغەدە دانابوو بەڕێوەی دەبرد. لەو سەر دەمەدا نەغەدە ماڵە بارزانیەكی زۆری لێبوو. شێخ ئەحمەدو شێخ سادقو شێخبابۆ، و شێخ... برای و مەلا مستەفا، واتە هەموو

براکانیماڵیان لە نەغەدە بوو. بە نێو ئەو چەند ماڵە لە نەغەدە مەشهور بوون.
دایکم منی بردە قوتابخانە نێوی نووسیم، گوتیان تەمەنی کەمە دەبێ جارێ لە کلاسی (تەهیە) بێت. واتە کلاسی ئامادە.
لەوێ دوو مامۆستا واتە ژنێك و پیاوێك ئێمەیان ئامادە دەکرد. بە نێوی یای حەلیم و میرزا حەسەن. لەدوای تێکچوونی کۆمار، میرزا حەسەن، کەبە حەسەن هەللاج بەناوبانگ بوو، لەگەڵ یای حەلیمی وەستا ڕەحمانی، دەوڵەت کاری لە هەر دووکیان ئەستاندەوە.
حەسەنی کاکاغازادە کە ڕەئیسی قوتابخانەی نەغەدە بوو، چۆوە مەهابادو تا ئەو دوایانە لە مەهاباد وەك دەبیر دەرسی دەگوتەوە. ڕەحمانی ئیمامی جێگری ڕەئیس بوو، ئەویش کاریان لێ ئەستاندەوەو ناچار بۆ دابینکردنی ژیانی خەریکی خەیاتی بوو. ناوبراو وەك کوردێکی چالاك و تێکۆشەر، ئەندامی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران بوو. لەساڵی ١٣٣٨ی هەتاوی دوای گیرانی کاك ئەحمەد ئاهەنگەری، تا ڕووخانی دەوڵەتی شاو هاتنی ئاخوندەکان، کاك ڕەحمان بەشێوەی نهێنی بەرپرسی کۆمیتەی حیزبیی شارستانی نەغەدە بوو.
من لەئوروپا بووم ئەم دواییانە خەبەرم زانی کاك ڕەحمانی ئیمامی و هەروەها حاجی محەمەد ئەحمەدی کۆچی دواییان کردووە. ئەو دوو ڕەوانشادە تا مابوون سەربەرزانە ئەرکی نەتەوایەتی خۆیان بەجێ هێناو تا هاتنە سەرکاری کۆماری ئیسلامی بە نهێنی کاریان کرد. دوای هاتنە سەرکاری ئەو مەلا نیگبەتانە، ئەوان بە هۆی پیریی وازیان لە حیزبایەتی هێنابوو. گیانیان هەرشادو یادیان پیرۆز بێ.
کۆمیتەی حیزبی شارستانی نەغەدە بە بەرپرسایەتی میرزا ڕەحمانی ئیمامی بەرێوە دەچوو. ئەو کات کۆمیتەی شار بریتی

بوون لە سێ کەس واتە میرزا ڕەحمان ئیمامی، کاك ئەحمەد ئەورازی و محەمەدی ئەحمەدی. تا ڕووخانی حکومەتی شا ئەو سێ کەسە بەرپرسایەتی نەغەدەو سندوسیان بەملەوە بوو.

دێمەوە سەرباسی قوتابخانە. دوای چەند مانگێك بە هۆی تەنگیی جێگا لەکلاسی ئامادە، من و کوڕێکی تر بە نێوی مستەفا عەزیزی کوڕی سەید حەمەدەمینی پۆستچی، بردیانین بۆ پۆلی هەوەڵ. ئەو ساڵە لە پشوودانی هاویندا بوو کە بە چەند هێرشی ناڕەوای هێزی سەرکوتکەری دوژمن، بە داخەوە کۆتایی بەتەمەنی کۆماری میللی دێموکڕاتی کوردستان هات و ئیتر من پۆلی دووی قوتابخانەی کوردیم نەدیتەوە و دەرس خوێندن بەزمانی دایکی لە کوردستان کۆتایی پێهات.

دەوڵەتی حەمەڕەزاشا زۆربەی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی کۆماری  کوردستانی گرتبۆوەو مەهاباد گیرا بوو. بەڵام بە هۆی بوونی بارزانیەکان نەغەدە هەر وەك خۆی بەدەستەوە مابوو، بە تایبەتی دوای گیرانی مەهاباد مەلا مستەفاش کە ماڵ و ژنو منداڵی لە نەغەدە بوو، هاتەوە نەغەدە. لەبەر ئەوەی ئەم کتێبە بیرەوەری تایبەتییە، بۆیە باسی بارزانیەکان ناکەمو بەشێوەیەکی دیکە دامرشتووەو هیوادارم دوایی بە تەواوی وێڕای شەڕەکانی سندوسو شنۆ و دەشتەبێڵ و مەرگەوەڕو... تا پەڕینەوەیان لە چۆمی ئاراس، بە دوورو درێژی لە کتێبێکی تردا بیخوێننەوە.

پێویستە بگوترێ لەگیرانەوەی نەغەدەدا لات و لووتی عەجەمی ئەو شارە لاوێکی هەڵکەوتووی نەغەدە بەنێوی ئەحمەدی خدرشێربەگی کە لە کۆماری کوردستاندا قۆڵسووری (شارەبانی) بوو لە قەراغ نەغەدە لە چۆمی پیرۆزبەرازیدا سەریان بڕیو شەهیدیان کرد. هەروەها هەر ئەو ڕۆژە قۆڵسوورێکی دیکە بە نێوی ئەحمەد ئەمینی کوڕی کاك مەحموود کە لە مەهاباد

دەگەڕێتەوە، لە نێوان نەغەدەو دزە دا عەشایری تازە جاش کە نێویان نابوون (سوارەی سکۆرت) و بەرەو پیری لەشکری سەرکوتکەری حەمەڕەزاشا دەچوون، زۆر نامەردانە لە پشتەوەڕا دەستڕێژی لێدەکەن و شەهیدی دەکەن. یادی ئەو دوو قۆلسوورە ئەرك ناسە بەخێرو گیانیان شاد.

## دووباره چوونەوە بۆ دێ!

برا گەورەکەم واتە سادق کاوە، مەشهوور بوو بە مەلا سادق. لە کۆماری کوردستاندا لە پۆستی شیرنبلاغ کارمەند بوو، کە ڕژیم هاتەوە نەغەدە گرتیان. بە هۆی واسیتە، بە تایبەتی حاجی حەسەن جۆخۆری ئاڵیاوێ دوای چەند مانگێك ئازاد کراو مسافیر خانەو چایخانەیەکی دانا. ئەوکات لە نەغەدە پێنج کەس واتە کەریم حیسامی، سادق کاوە، ڕەحیم سوڵتانیان، ئەحمەد ئاهەنگەری و مستەفای ئاغامەجیدی، لە کارو باری سیاسیدا هەڵسووربوون.

سالی ١٣٣٢ دەورانی دوکتور مصدق ئەو کەسانە وەك بەرپرسو هەڵسووڕێنەری سیاسی، کاروباری نەغەدەو ناوچەی سندوسیان بەڕێوە دەبرد. دوابەدوای کودتای سەرلەشکر زاهدیو تێشکانی دوکتور محەمەد موسەدیق، خەڵکێکی زۆر گیراو ئازارو لێدانێکی زۆریان کردن. ئەو کات هێشتا ساواك پێك نەهاتبوو. ژاندارمەری بە پووڵو واسیتەو بەرتیل لە ماوەی حەوتوێکدا زیاتر لە شەست کەسیان ئازاد کردو تەنیا سێ کەسیان لەوانەی گیرابوون هێشتنەوە. ئەو سێکەسەیان بە نێوی تێکدەرو ئاژاوەگێڕی مەڕامی ئیشتراکی (کومۆنیستی) ناردە ڕەزاییە (ورمێ)ی ئێستا. ئەو ٣ کەسە بریتی بوون لە سادق کاوە، محەمەد ئەحمەدی و حەسەنی ئیسلامی. زۆربەی ئەوانەی کاری سیاسییان دەکرد نەغەدەیان بەجێ هێشتبوو بۆئەوەی نەگیرێن. دوایی بە واسیتە گەریو ڕیشوەت هاتنەوە. دوای هەشت نۆ مانگ حەسەن جۆخۆر دیسان بوو بە زامنی کاکم و ئازادی کرد. ئەو چەند مانگەی کاکم گیرا بوو بە هۆی مۆرکردن و داخستنی مسافیرخانەکەو، نەدانی کرێ، هەرچی کەلوپەلی لە موسافیرخانەکە دابوو هەڕاجیان کردو وەبەر کرێی ئەو چەند مانگەیان خست. کاکم بڕێکیش

قەرزدار هاتەدەرو هیچ شتێکمان نەمابوو. هەرچەند کاکم زۆری ڕق لە کاری مەلایەتی بوو، بە ناچار بوو بە مەلای گوندی ئاڵیاوێی شێخان. هەر بۆیەش بە کاکمیان دەگوت مەلای مصدیق!

ساڵ ساڵی ۱۳۳۲ی هەتاوییە. حیزبی دێموکڕاتی کوردستان بەرەو سەربەخۆیی حیزبی هەنگاو داوێ کە بۆ هەمیشە لە حیزبی توودە هەڵبڕێ. ئەو هەنگاوە بووە هۆی ئەوەی زۆر نەکێشیو لە حیزبی مادەر دابڕێ.

## سەرەتای سوارەی سکۆرتو زەربەیەکی کوتوپڕ!

بۆ ئەوەی لەبیر نەکرێ بالە پێشدا باسی جاشو سەرەتای پەیدا بوونی جاشایەتی لەکوردستانی رۆژ هەڵات بکەین. کاتێك ڕژیمی تاران، مەهابادو بەشێك لە کوردستانی گرتەوە، بەشێکی زۆری ئاغاوات کە خاوەنی ملْکی زۆر بوون، لەو سەردەمدا شانازییان بەوە دەکرد کە تفەنگی دەوڵەت هەڵگرن و دژی ئازادیخوازانی کورد هەڵسو کەوت بکەن.

ئەوکات ئەوانەی چەکی ئاغاواتیان هەڵدەگرت، دەوڵەت نێوی لێ نابوون: سوارەی سکۆرت! سوارەی سکۆرت لەو کەسانە پێك هاتبوو کە ئاغاکان بە نۆکەریان دەگرتنو چەند بارە گەنمێکیان دەدانێ. ئەو پووڵەی ئاغاش لە دەوڵەتی وەردەگرت خۆی پێ دەوڵەمەند دەکرد یان دەیکرد بە قومارو دەیدۆڕاند.

سەرەتای هاتنەوەی لەشکری سەرکوتکەری محەمەد ڕەزاشا بوو بۆکوردستان. ڕژیم دەیویست کورد بەکورد لەکوردستان وەدەربنێو بەهۆی خاوەن ملْکەکان خەڵکی چەکدار بکات و نێویان لێ بنێ سوارەی سکۆرت لەگەرمە گەرمی بوون بە

سوارەی سکۆرتدا شەوێك لە گوندی سێڵوێی لاجانێ ژمارەیەک لە ئاغاکان بەمەبەستی پەرە پێدانی سوارەی سکۆرت و پلانی نوێی دژی بارزانییەکان، کۆدەبنەوە.

بارزانیەکان لە کۆبوونەوەی خاوەن مڵکەکان ئاگادار دەبن و دەزانن کە پلانی چەکداربوون لە ئارا دایەو کۆبوونەوەی خاوەن مڵکەکان بە دژی ئەوانە.

بارزانیەکان شەوێ لە کاتی نانخواردن لێیان وەژوور دەکەونو نزیك بە شازدە کەس لە ئاغاکان واتە هەرکەس لەوژووردا بوون، ڕیزیان دەکەنو تاقیان لێدەبرن. بەغەیری یەك نۆکەر کە لەبن کەلاکەکاندا خۆی دەشارێتەوە، ئەوانی دیکە هەموویان دەکووژن. کردەوەو حەرەکەتی بارزانیەکان زۆری شلەدا بەپەرەپێدانی سوارەی سکۆرتو دەکرێ بڵێم زۆربەی ئاغاکان وازیان لە کاری جاشایەتی هێنا. ئەوە سەرەتای جاشایەتی بوو کە لەنێو خوێندا نوقم کرا.

لەسەر سوارەی سکۆرت نوکتەیەك بۆ پێکەنین دەگێڕمەوە. نزیك بە سیچل کەس لەو سوارە سکۆرتانە کە سەر بە ئاغاکانی دێبۆکری لای قونقەڵاو کۆزەکەرێزو دەوروبەر بوون، وەدوای شکستی پێشمەرگە و بارزانی کەوتبوونو گەیشتبوونە نێوانی ئاڵیاوێو کاموسو نەرزەمێز، بارزانیەکان هەواڵیان وەر گرتبوو کە سوارەی چەکداری خاوەن مڵکەکانی شاروێران وەدوایان کەوتوونو لە دەشتی سندوسدا بڵاو بوونەوە. سوارەکان بەرەو لای شنۆ ڕێگا دادەگرن، تا بزانن بارزانیو پێشمەرگەی کۆماری کوردستان لە کوێن تەقەیان لێ بکەن و ڕاویان بنێن. بارزانیی باران دیتووی بەئەزموون بە نێو جۆگەی نەرزەمێزدا لەسەر چەنگان دێنەخوار تا ڕاست بە ڕاستی ئەو سوارانە دەبن کە بەخەیاڵی خۆیان ڕێگایان داگرتبوو بارزانی ڕەپێ نێن و ڕێگا بۆ ئەرتەشی ئێران پاك بکەنەوە!

لە پڕڕا بارزانیەکان، تەقە لە سوارەی سکۆرت دەکەن و پتر لە پازدە کەسیان لێ دەکوژن. ئەوانی تریش هەربابایەی بەلایەکدا هەڵدێنو بڵاوەی دەکەن. هەشت نۆ سوارێکیش بەرەو ئاڵیاوێ ڕێگا دادەگرنو دەگەنە نێو دێ. جێگای پێکەنینەکەی لێرەدایە کە ئێمە خەڵکی ئاڵیاوێ لەبن دیواری مزگەوتێ ڕوو بەڕووی کانی نێو دێ ڕاوەستا بووین کە سوارەکان گەیشتنێو دابەزین ئەسپەکانیان ئاودا. سەر دەستەکەیان لەپاش ئاودانی ئەسپەکەی ، کاتێ لغاوی دەکرد، زوو زوو لغاوەکەی لە بن کلکی ئەسپەکە ڕادەکرد وایدەزانی زاریەتی. کابرا لەترسان ئەوەندە خەجڵابوو سەرو قوونی ئەسپەی لێ تێك‌چووبوو. بەڕەحمەت بێ پیاوێکی قسە خۆش و نوکتەزانی ئاڵیاوی بەنێوی ئەحمەدیلە، هەرای کرد؛ کاکە کاکە مەترسێ ئێرە بارزانیی لێ نییە، ماڵخراپ تۆ بۆلەترسان سەروقوونی ئەسپەکەت لێ تێك چووە؟ ئەوە قوونیەتی بابم، لە زاری بکە!
بەکورتی ئەو ڕۆژە سوارەی سکۆرت نەهاتیان بوو، شکانو ئەسپو نەفەراتێکی زۆریشیان لێکوژرا.

## چۆنیەتیو ناهەمواریی بارزانیەکان!

لەشکرو چەکداری بارزانیەکان کەم نەبوون. سەرەڕای ئەوەش بەر پرسایەتی خاوخێزانێکی زۆریان بەسەرەوە بوو. لە لایەن ڕژیمی ئێرانەوە هێرشیان کرابووە سەرو لە هەواو زەوی بە بۆمباو تۆپی دوورهاوێژ لێیان دەدان. سەرەڕای ئەوەی ئەرتەش بەدوایانەوە بوو، جاشی کوردو قەرەپەپاغی چەکدار کراویش چاوساغ و پێشقەرەوڵیی ئەرتەشیان دەکرد. لەو کاتەدا کە ئەو فشارەیان لەسەر بوو، یارمەتی دەرێکیش نەبوو بیانژێنێ. دەبێ چبکەن کە هەم ماڵ ومنداڵەکانیان بەرەو سنووری عێراق ڕزگار

بکەن، هەم پێش بە لەشکری دوژمن بگرن کە وەدوایان کەوتوون. هەروەها خاوخێزانیان لە تانگ‌وتۆپو پێشڕەوی عەجەم بپارێزن و نەیەڵن خۆیان‌و خێزانیان ڕووت‌و برسی بن. زۆر کەس وای بیردەکردەوە کە بارزانیی زوڵم لەخەڵك دەکەن و زۆریان فشار بۆ خەڵك هێناوە، من ئەو کات کە مێرمنداڵێك بووم ، باوەڕم بەو پڕوپاگاندە دەکرد، پێم وابوو خەڵك ڕاست دەکات‌و ئەوانەی دژایەتی لە گەڵ بارزانیان دەکەن حەقیانە. تائەو کاتەی دەورانی منداڵیم تێپەرکردو وەك لاوێکی دژ بەجاش‌و جەیش بیرم کردەوە، بیرەوەری ناخۆشی دەورانی منداڵیم لەبیر مابوو. ئەو تەنگانە ناخۆشەی بۆ بارزانیەکان هاتبووە پێش تائێستا هیچ کەس تەنگانەی ئاوەهای نەدیوە. بەڕاستی ناچار بوون بەزۆر ئاردو نان لە خەڵك بستێنن. ناچاربوون کابرایەکی تەویلەیەك مانگاو پاتاڵی هەیە، گایەکی لێ بستێنن و تامەزرۆی ماڵو منداڵی خۆیانی پێ بشکێنن. ناچاربوون بەزۆری ئەسپ و گوێدرێژ لە خەڵك بە سۆغرە وەربگرن و ماڵومنداڵی خۆیانی پیڕاگوێزن و زۆرشتی دیکە.

لێرەدا من لەبەر ئەوەی زیاتر لەمە لە بیرەوەری تایبەتی لانەدەم، واز دێنم.

## ڕووخانی کۆمارو جێگیربوونی ڕژیم !

جارێکی دی ڕژیمی سەرکوتکەر لە کوردستان جێگیر بۆوەو، قازی محەمەدو هاوڕێکانی گیران. دەشتی شنۆ وسندوس بە هێرش بۆ سەر بارزانیەکان چۆلکراو دیسان سایەی شوومو ڕەشی ژاندارم باڵی بەسەر ناوچەکانی کوردستاندا کێشایەوە، دەسەڵاتی دەرەبەگایەتی و ژاندارم هێزی لەخەڵکی کورد بڕیبوو. ئەوکات خەڵك بۆیان دەرکەوت کە بەدەست ڕژیمی داسەپاودا چەندە زەلیلو ژێردەست و دیلن.

لەو کاتەدا کە خەڵك هەستیان بەوەکرد ئازادیەیان لەدەست چووەو ناگەڕێتەوە، دەستی خۆیان شکاندەوەو پەشیمان بوونەوە. بەڵام کار لەکار ترازا بوو. پێشتر دەبوایە هاوکاریان کردبایەو لە دژی لەشکری کۆماری کوردستان چەکیان هەڵ نەگرتبایەو نەببانە سوارەی سکۆرتو کەوا سووری پێش لەشکر. داخی گرانم مێژوو نیشانی داوە لە ڕابردوودا، کە کارو پیشەی گەلی کورد پەشیمانیو دەستشکاندنەوە بووەو ئێستاش کە ئێستایە نە ئەزموونمان لە ڕابردوو وەر گرتووە، نە ئاقلیش بووین کە هەڵەکان دووپات نەکەینەوە!

کاتێك ڕژیم جێگیر بوو و ترسی نەما، لە بەرەبەیانێکدا فڕۆکەکانی بەسەر دەشتی سندوسو شنۆ و ناوچەکانی تری کوردستاندا خولیان دەداو پەڕەکاغەزی ڕەنگاو ڕەنگیان بەسەر شارو گوند دا دەباراند. ئەوان جێژنی خۆیان بە بڵاوکردنەوەی ئەو پەڕەکاغەزانە بە گەلی کورد ڕادەگەیاند، واتە مزگێنی هەڵاوەسینو لە سێدارەدانی قازیو سەیفو سەدریان دەدا بە گەلی کورد. دەمدیت پیرەپیاوان دەگریان و شینیان دەگێڕا. بەڵام داخی گرانم کار لەکار ترازا بوو، بە شیوەنو گریانو پەشیمانی بۆ کۆماری کوردستان هیچ نەدەکراو تازە بەگریانو لە خۆدان نە

ئاڵای سێ ڕەنگی کوردستان دەشەکاوە، نە کۆماری جوانەمەرگ کراوی کوردستان دادەمەزراوە...

## وەخۆهاتنەوەی دووبارە!

تەمەنم لە دەوری چاردە پازدە ساڵیدایە. کاکم مەلای گوندی ئاڵیاوێیە، ئەمن بۆ ماڵی خۆمان جووڵە جووڵو هاتو چۆی نائاسای دەبینم. کەسانێك وەك میوان دێن و وەك میوان دەمێننەوە، بەڵام خەریکی سرتوخورتی نهێنینو وتەو گفتوگۆیان شتێکی دیکەیەو ئاسایی نییە. شتهایەك دەڵێن، ئەویش بۆمن نامۆیەو لێی تێناگەم. باس باسی کوردە، باسی کوردستانە، کەس باسی تووتن و چەوەندەرو ئەسپی چاكو کەڵی بەقەوەتو پووڵو پارە ناکات، باسەکان لەسەر زوڵمو زۆریو هەژاریو دەرەبەگ و بەشکردنی زەوی و زارو ژاندارم و شۆرش و ئەوانەیە.

وردە وردە بەو شێوە قسەو باسو وتو وێژە فرچکم گرتو کەلێنێکی نێو دڵم کردە جێگای دابین کردنی ئەو قسەو باسانە. هاتوچۆی بەردەوامی پێکەوەی کاك کەریم حیسامی و کاك ئەحمەد پیرمەندو مەلا سادق کاوە ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ گەرمتر دەبوو، جارو بار کاریان بۆ منیش دەدیتەوە، واتە بە سواری کەرێ دەیان ناردمە لاجان، شنۆ، سندوسی خواری و نەغەدە وشاروێرانو... بنکورتانی کەرەکەیان پڕدەکرد لە بەیانو ڕۆژنامەو کارتی یارمەتی، پێیان دەگوتم ئەوانە قاچاغن و ئەگەر گیرای حاشایان لێ بکە واو وا بڵێ...

زۆرجاران ئەو وردەکارانەیان پێدەکردم، بۆخۆم نەمدەزانی کە ڕاپەڕاندنی ئەو وردەکارانە ئەرکێکی حیزبی و سیاسییە بەمنی دەسپێرن. پێشم ناخۆش نەبوو کە ئەو کارانەیان پێدەسپاردم. تا

ئەو کاتەی تەمەنم گەیشتە نیزیکی هەژدە ساڵ مەگەر کۆبوونەوەو قسەو باسەکان زۆر گرینگ بایەن دەنا لەمنیان نهێنی نەدەکرد. منئەو کات پێموابوو ئەوەی دەیکەن دروستە، بەڵام کاتێك دەستم کرد بەکاری ڕەسمی تەشکیلاتیو موتاڵای کتێبو نووسراوە، ئەوکات زانیم نەپاراستنی نهێنیيان لەڕاست من نادروست بووە. زۆر جار ڕابردووی خۆم وەك ڕەخنە وەبیریان دەهێنایەوە. هەژدە ساڵم تەواو نەکرد بوو کاك قادرشەریف کۆمیتەی ناوچەی شنۆ و سندوسی پێناساندم کە کاری تێدا بکەم. لێرەدا خراپ نییە ئاماژە بەهەلومەرجی ئەوکات بکەم.

خوێندەوار لە ناوچەدا بێجگە لە فەقێو مەلا و میرزای ئاغا کەم دەست دەکەوت. لەبەر ئەوەی من تۆزێکم خوێندەواریی هەبوو دەمتوانی بنووسمو بخوێنمەوە. هەروەها لەو ماوەیەشدا بێئەوەی بۆخۆم هەستی پێبکەم کاکم لەگەڵم خەریکبوو زیاتر فێری کوردی بم. بەو شێوەیە تێکەڵاوی کاروباری ڕێك خستنیان کردم. کۆمیتەی ناوچەی شنۆیە لەحەوت کەس پێك هاتبوو، مەلا محمود ئاخشی دانیشتووی نەرزیوێ. خوێندەواری ئەو هەر لە حەددی **نێو** نوسیندا بوو. مام ڕەسولی جبریلاوێ نەخوێندەوار بوو، سەید وەفای سەردەرێ نەخوێندەوار بوو، حەمەسوڵتان نەخوێندە وار بوو، خدراغای خانلەر برە خوێندەواریەکی هەبوو. محەمەدی عەوڵای عومەران نەخوێندەوار بوو، مەلا سەید تاهیر مەلای ئاوایی بوو. بەکورتی بە خوێندەوار و نەخوێندەوار ناوچەکەیان هەڵدەسووڕاند. لەبەر ئەوەی خەڵکەکە خوێندەواری نەبوو، هەر ڕێکخستنێکی دروستماندەکرد دوای چەند مانگێك یا هەڵدەوەشاوە، یان زۆر بەلاوازی دەماوە.

## کۆبوونەوەی کۆمیتەی بڵباس

لە ماوەی دوو ڕۆژاندا ٧ کادری حیزبی دێموکڕات لە ئاڵیاوێ لە ماڵی کاکم یەکتریان گرتەوە. کەبریتیبوون لە کاك عەبدوڵڵای ئیسحاقی، کاك سولەیمان موعینی، کاك هاشمی ئەقەللطلاب، کاك کەماڵ سولتانی، کاك سمایلی قاسملوو، کاك حەمەدەمینی ڕاتبی و کاك محەمەدی بەحرلعلووم، ئەو حەوت کادرە کۆمیتەی بەڕێوەبەری تەشکیلاتی کوردستان بوون دوای بەجێ هێشتنی حیزبی توودە بە نێوی کۆمیتەی بڵباس خەریکی کارو تێکۆشانی سیاسی بوون. دەکرێ بڵێم ئەوانە حیزبی دێموکڕاتی کوردستانیان زیندوو کردبۆوە. ئەوەش بڵێین کە لەسەرووی ئەوان بە شێوەی ئینتصابی کۆمیتەی بەڕێوەبەری کاتیی هەبوو، کە بریتی بوون لە کاك عەزیز یوسفی، کاك غەنی بلووریان، کاك دوکتور عەلی مەولەوی، کاك ڕەحمەتی شەریعەتی. بۆ ئەوەی دوور نەکەوینەوە دێمەوە سەرکۆبوونەوەی کۆمیتەی بڵباس لەئاڵیاوێ. دیارە لەو کۆبوونەوەیەدا نەخشی من تەنیا خزمەتو چا تێکردن بوو. بەڵام لە هەوەڵی بەیانیەوە کەمو زۆر ئاگادار بووم چ دەڵێن و چۆن قسە لەگەڵ یەکتر دەکەن. بەڕاستی من کەمتر دەمزانی خەریکی چینو چدەکەن، بەڵام دەمزانی قسە لە کاری سیاسی دەکەن. گەیشتبوومە ئەو جێگایەی کە تێبگەم دەیانەوێ کار بۆ کورد بکەن. کاریان گەیشتە دابەشکردنی ناوچەکان کە کێ، کوێ بەرێوە بەرێ و چی بکەن. زۆربەی باسو ئیستدلالەکانیان بە وتەکانی مارکسو لێنین دەست پێدەکرد، یان وشەی مارکسیزمو لینینیزم بوو دوپات دەبۆوە. ئەوکات من ئەسڵەن نەمدەزانی دەڵێن چی. من ئەو وشانەم لە کوولەکەی تەڕیشدا نەبیستبوونو نەمدەزانی. لە کۆبوونەوەکەدا زۆر جار دەمدیت لێکتر سووردەبوونەوە و

پێکتریان دەگوت نەخێر مارکسو لینین وانالێن. زۆرجار بیرم لێدەکردەوە بە خۆم دەگوت؛ دەبێ ئەوپیاوە ناودارانە کێ بن کە وا لە هەموو کەس گەورەترن؟

لە ڕاستیدا کادرەکانی پێشوو لەو دەوراندا بەبیرو بۆچوونی حیزبی توودە پەروەردە کرابوون و بە خوێندنەوەی کتێبی تەرجومە کراوی حیزبی توودە ڕاهاتبوون. دیارە دەورانەکە ئەوەی هەڵ دەگرت. شتێکی لەهەمووی گرینگتر ئەوە بوو کاتێ کادرێکی حیزبی قاچاغ دەبوو، تەنیا پەناگاو پشتو پەنای حیزبی توودە بوو کە لە شارە گەورەکانی وەکوو تارانو تەورێزو... دەیانشاردنەوەو کاریان بۆ پەیدا دەکردن و، زۆر شتی تر.

بەوجۆرە دەورانی لاوێتیم پێگەیاندو تێگەیشتم کە نەتەوەیەکی ژێر دەستو وڵاتێکی داگیرکراومان هەیە.

## رۆیشتنی کاکم و بەجێ هێشتنی مەلایەتی

کاکم لە دانیشتنی لادێو کاری مەلایەتی وەڕەز ببوو. ڕۆژێك بڕیاری خۆیداو لە دێو مەلایەتی خوداحافیزی کردو بەرەو شاری نەغەدە ماڵەکەی تێك ناو باری کرد. دوای دامەزران دوکانی گرتو چڵەوکەبابیەکی کردەوە. وردە وردە ژیانێکی باشی پێکەوەنا. هەمیشە لە هەموو شوێنێك دەیگوت مەلایەتی تەنیا پێشی سواڵکردنی گێڕاوەتەوە. حەزی لەکارو باری ئازاد بوو. زۆری بڕوا بەمەلایەتی نەبوو، هەر بۆیەش خۆی لە چەنگی مەلایەتی رزگار کرد. لە ڕاستیدا خۆی بە کوردێکی نیشتمانپەروەری مارکسیست دەزانی. بە کورتی لە شاری نەغەدە کارەکەی گرتبووی‌و زۆری هەوڵدا منیش بچمە نەغەدە، بەڵام من دڵم بەدێ خۆشتر بوو. بۆخۆم لە گوندی ئاڵیاوێ بە

سەرمایەکی سیچل تمەنی ئەوکات، لە خانوێکی چکۆلەدا خەریکی دوکانداری بووم.
لە تەمەنی شازدە حەڤدە ساڵیدا دوکانێکی چکۆلەم دانا بوو بە سەرمایەی ئەو پەڕی چل تمەن. واتە چەند کەلاف دەزوو، دەرزی، بنێشت، ئیستکانو پیاڵە، قەندو چاو پەڕەسیغارو شەمچەو چەغماغی نەفتی و... وەك سەڵتیکی لاو ژیانم دەسووڕاند.
منیش وەك لاوێکی شایی بە دنیا، خۆم لە نێو لاوەکاندا دەدیتەوە. لاوێکی بێسەروەتو سامان. هەرئەوەندەم هەبوو کە بەخۆم بسەلمێنمو بڵێم ژیان دەکەم. دیارە لە منیش بێسەروەت و سامانتر زۆر بوون. بۆ خۆم پێم وابوو هەموو دنیام هەیەو دەبێ ژن بێنم. دیارە ئەوەم دەزانی کە ژن هێنانی نەبە چەورو شیرنیو خواستن و شاییو گۆوەند، بەڵکوو بە عاشق بوون و دڵ وەدەست هێنانی کیژێكو هەڵگرتنی، کە ئەو کات زۆر باو بوو. سەیرەکەی ئەوە بوو بە هەموو کچێکیش ڕازی نەبوومو دەبوایە جوان بێو دڵم بیگرێ! ئاڵیاوێ ماڵێکی خانەدانی لێبوو بە نێوی مەلا مەحمود، ناوبراو کچێکی شیرن و لەبەر دلانی هەبوو بەنێوی زارا، زۆرکەس لە لاوەکان پێیاندەگوت، بەلام جوابی هەموو کەسی نەدەداوە. بەڕاستی لەدڵەوە خۆشم دەویست بە قەولی کوردی پڕ بەدڵ حەزم لێدەکرد. سەیرەکەی لەوە دابوو لە ڕووم هەڵنەدەهات پێی بڵێم زارا خۆشم دەوێی. شەوو ڕۆژ بیرم لێدەکردەوە کە چۆنی پێبڵێم، بەلام بێجگە لەسەلامو عەلەیك قەت لەڕووم نەهات بڵێم زارا تۆم دەوێ. ڕۆژێکیان خەبەرم زانی زارایان داوە بەشوو بە کوڕێك لە گوندی سەیداوای شنۆ. شووکردنی زارا تەواوی جحێڵی ئاڵیاوێی ئازیەتبار کرد. لاوەکان پێیان وابوو من قسەم لەگەڵی هەیە، کاتێك شووی کرد گاڵتەیان پێدەکردم و دەیانگوت چاوی ڕەشت کاڵبووە!

.................................................................

ڕاستە کە من زۆرم خەم بوو، تەنانەت کە مێردیکردو بردیان بەدزی گریاشم. لاویەتی سەیرە، یەکلایەنە حەز لەکەسێك بکەی قەتت پێ نەگوتبێ دوایەش بۆی بگری!

بەڕاستی دنیای لاویەتی سەیرە!

خەمی زارای مەلامەحمود، عاشقی زارایەکی دیکەی کردم، واتە ئەمجارە زارای وەستا ڕەسووڵ. خۆشەویستیی ئەو زارام گوێزتەوە بۆ زارایەکی دیکە. جاروبار بە خۆم دەڵێم؛ ڕەنگبێ ویستبێتم خەمی زارای مەلا محمودم لەبیربچێتەوە بۆیە دیسان زارا نێوم هەڵبژارد.

بەڕاستی عاشق بووم، عاشقێکی بێقەرار. عاشقبوونی ئەوجار زۆر بە سۆزو بەتینترو قووڵتربوو. هێشتا پێم نە گوتبوو کە خۆشم دەوێی یان حەزت لێدەکەم بەڵام بەچاو دیار بوو سەرنجی یەکترمان ڕاکێشابوو. ڕۆژێك لەگەڵ کچێکیتر لە نێو تووتنانڕا دەهاتنەوە، هێندێکیان وردە تووتن کە پێیدەکوترێ سووتوو، یان سووتەکە، بۆ هێنابووم. زۆر خۆشحاڵبووم. کاتێك بەیانی بەوێداهات، پێم گوت زارا تووتنەکە زۆر خۆش بوو دیسان بۆم دێنی؟ پێکەنیو گوتی بابزانم. پێم وا بوو ئەوەندە جوابە دنیایەك دێنێ! وام دەزانی شەقولقەمەرم کردووە ئەو قسەم لەگەڵکردووە! لەبەر ئەوەی زۆر بەڕووان تەنك بووم ئەوەندە گوتنەم بەکارێکی زۆر گەورە دەزانی.

زارا جارێکی دیکەشی سووتەکەی تووتنی بۆهێنام، بەڵام من هەر لە ڕووم هەڵنەهات جارێك لەجاران قسەی عاشقبوونی خۆمی لەگەڵ بکەم و بڵێم خۆشم دەوێی!

ئاڵیاوێ دوو ژنی لێبوو بە نێوی زڵەخا چۆلی و فاتمە دینگە. ئەو جووتە ژنە لەلای لاوەکان زۆر خۆشەویست بوون، لە بەر ئەوەی لەنێوان کچان و کوڕاندا قسەیان دێناو دەبرد، واتە دڵدار دەڵاڵیان بۆ کوڕان دەکرد. من کە بۆ خۆم لەڕووم هەڵنەدەهات

بە زارا بڵێم، ئەم دەوێرا بە زڵەخا چۆلیش بڵێم بۆم بە زارا بڵێ، چونکە لەبەر ئەوەی زار بەهاوار بوو دەترسام ئاشکرا بێت و زارا لەلایەن براکانی زیانی پێبگات. بەڵام فاتمە دینگە هێدی و هێمن و قسە هەڵگربوو. ڕۆژێك بە فاتمە دینگەم گوت بۆم بەزارای وەستا ڕەسوڵ بڵێ کە من زۆرم خۆش دەوێ. گوتی بەیانی وەرە ئێرە ناوبراو دێتە ئێرە هەویرم بۆ دەشێلێ لە ژوورێدا بەجێتان دێڵم بۆخۆتان قسە بکەن. زۆرم پێخۆشبوو. شەوێ تادرەنگانێك خەوم لێنەکەوت، تەنیا دەمویست دوو قسە سازکەم و بڵێم زارا من تۆم خۆش دەوێ! بەڵام بیرم لێدەکردەوە کە داخوا لە ڕووم هەڵدێ بیدوێنم؟ من ئێستاکە بیر لە کەم ڕوویی دەورانی لاویەتی خۆم دەکەمەوە خۆم پێ سەیرە!

بەیانی چوومە ماڵی فاتمە دینگە. زارا هات قۆڵی هەڵکردو هێڵەگی بۆ ئارد دابێژتن هێنا خوارو دینگەش ڕۆیشت بۆ دەرێ و ئێمەی لە ژوورێدا بەجێ هێشت. لە زارام پرسی بۆ ئەتۆی بانگ کردووە کاری بۆ بکەی؟ گوتی دینگە هات بەدایکمی گوت نەخۆشم، زارا بابێت یاریدەم بدات.

ئەو دووسێ وشەو پرسیارەو ئەو دووسێ وەڵامە بە نیو کاتژمێر تەواو بوو. ئەوەی شەوێ بیرم لێکردبۆوە و هەر لە دڵی خۆم دا دەمگوت و دەمگوتەوە، بەزمانیش پێم نەدەکوترا! بیرم لەوە نەدەکردەوە ئێرە ماڵی فاتمە دینگەیە ئێستا دیتەوە باقسەی خۆم بکەم. زارم هەڵنەپچڕا ئەو دوو وشەی پێ بڵێم .

فاتمە دینگە هاتەوە ژوورێ. ناوبراو پێیوا بوو دەردە دڵیی خۆمان کردووەو قسەمان تەواو بووە. ئیتر من بە ناهومێدی هەستام ڕۆیشتم و هیچم بۆ نەکوترا. ڕۆژ هاتنو ڕۆیشتن. ماوەیەکی بەسەر چوو هەروا لە دڵەوە بەچاو دووراو دوور هەستی خۆمان دەردەبڕی.

جیرانێکم هەبوو بەنێوی کاك مینە، مەشهور بوو بە مینەکەچەڵ. ژنەکەی نێوی فاتم بوو، ڕۆژێك بانگی کردمو کوتی دەڵێن تۆ زارای وەستا ڕەسووڵت خۆشدەوێ. بزێکم هاتێو هیچم نەگوت. فاتم کوتی تۆ زانیوتە دوێنێ شەوێ هاتبوونە سەر زاراو بەخشیویانە؟ کەوای گوت قەڵەمی دەست و پێم شکا، پێم گوت خات فاتم بۆ خاتری خودای چم لێدەکەی، بەو خەبەرە پشتی منت شکاند. ئیتر نهێنیو نهێنیکاریم نەما.

داوام لێ کرد چارێکم بکە. گوتی ئێوارێ سەرێکم لێبدەوە، دەیبینم خەبەرێکت بۆ دێنم. زوو زوو چاوم لە ئاسمان دەکرد داخوا کەی ئێوارە دادێ بچمە لای خات فاتم کە لێم بۆتە فرشتە و زارا دەدوێنێ و هەواڵێکم بۆ دێنێ.

ئێوارە داهاتو بە پەلە بەرەو لای ماڵی خات فاتم وەڕێکەوتم. سەرم داخستبوو بەقەولی کوردی، بەهەزارو یەك جۆر بیرم لێدەکردەوەو لەگەڵ خۆمم قسە دەکرد. لە خۆم دەپرسی؟ بڵێی تازە قسەی بابی بشکێنێ، وەڵامێکی موسبەت بداتەوە بەمن؟ بڵێی ئەویش منی خۆش بوێ؟ یان ئەو چاوبڕکێو پێکەنینەمان بەخۆڕایی و ئی گەرم و گوڕی لاویەتی بوو؟

بۆخۆشم وەڵامی خۆم دەداوە کە دیارە خۆشی دەوێم بۆیە سووتووی تووتنم لەلکە دەسماڵیدا بەدزی بابی بۆدێنێ. باشە ئەگەر گوتی تازە کار لەکار ترازاوەو بابم منی بەخشیوە، من دەبێ چیبکەم؟ بەڕاستی ئەگەر هێندێك لاو خۆیان دەکوژن ناحەق نین. هەر شتێکی وایە لە ناهومێدییان خۆ دەکوژن. بەڕاستی پاش مێرد کردنی زارا نەمانم باشتر نییە لەوەی بژیم؟! لەبەر خودا دەپاڕامەوە ڕوحمم پێبکاتو... لە دەریای بیرو خەیاڵدا خۆم لە ماڵی خوشکە فاتم دیتەوە.

ناوبراو چاوەڕوانی چوونی منی دەکردو بە پێکەنین گوتی بە خێر بێی. پاشان بێ ئەوەی شتێکی دیکە بڵێ، گوتی هانێ بزانە ئەوە چییە؟

پارچە پەڕۆیەکی دا دەستم، کە لێم وەرگرتو کردمەوە دیتم سجیلی زارایە. گوتی زارا گوتوویە ئەوە سجیلی منە لەلای خۆی ڕاگرێ و ئەگەریش ئەو شەو نەڕۆین، بەیانی مارەم دەکەن.

باسی خۆشەویستی و ئەو شتانەی کوتران زۆر لەوەی باسمکردووە دوورو درێژترەو شەوان و ڕۆژانی زۆر لەسەر ڕێگای ڕاوەستاومو چاوبڕکێنمان لەگەڵ یەکتری کردووەو ئاخو داخمان بۆ یەکتری هەڵکێشاوە. هەرچەند قسەمان لەگەڵ یەکتر نەبووە، بەڵام ڕوحو گیانمان لەلای یەکتربوو. زارا کە سووتووی تووتنی دەگرتو بە دزی بۆی دێنام، من کە سوپاسو دەستخۆشیم لێدەکردو بەچاو هەزارو یەك ڕازو نیازمان لەگەڵ یەکتر دەگۆڕیەوە و بەچاوی ئەوینداری هەموو شتێکمان لێك وەر دەگرت، بەڵام شەرمێونی منو بەحەیابوونی زارا ئەو پەردەی نەدڕی کە ڕاشکاوتر لەگەڵ یەکتری بدوێین.

بەڵێ بەوەرگرتنی سجیلی زاراو هەواڵی شەوی ڕۆیشتن سەرم لێشێوا بوو. چونکە ماڵو دوکانەکەم بەجێ دەما، بەڵام لە پێش چاوم دەنگە شەمچێك بوو. بە پەلە خۆم گەیاندە هاوڕێی گیانیگیانیم سولەیمانی برای مەحموود پیرۆت. منیش ساڵی پێشوو حەلیمی کچی مرادە چەورەم لەگەڵ هەڵگرتبوو. ئەویش داستانێکی دوورو درێژەو ناچمە نێو ئەو داستانەوە.

بە پەلە بەرەو ماڵی سولەیمان ڕۆیشتم، لەپشت دەرگایە ڕا هەرام کرد سولەیمان گیان وەرە دەرێ! ئەوان دەیانگوت وەرە ژوور، منیش دەمگوت برا گیان زووبە وەرە دەرێ قسەم پێتە! سولەیمان لەسەر نانی هەستاو هاتەدەر. کاتێك مەسەلەی

دانانی قەول و قەراری زارام بۆ گێڕاوە، پێکەنی و ماچیکردم، گوتی ورە نانەکەمان بخۆین با برێکی دی تاریك بێ دەرۆین.
من دەمویست جارێ نهێنی بێ. سولەیمان ڕووی لە زڵەخای خوشکی و حەلیمی ژنیو مەحمودی برای و دایکی کردو گوتی شۆرباوی بۆ میرزا سەعیدی تێکەن با خەبەرێکی خۆشتان بدەمێ. ئەو شەو زارای وەستا ڕەسووی هەڵدەگرین و دەڕۆین. ڕەببی موبارەکی بێ. تێگرا چەپڵەیان لێداو پیرۆزباییان پێگوتم. ئیتر نهێنی هەڵگیراو هەموو شتێکم بۆ باسکردن.
نازانم چۆنم نان خوارد. سولەیمان زوو زوو دەیگوت؛ ئۆخەی ئەوە منیش تۆڵەی خۆم دەکەمەوەو ژنت بۆ هەڵدەگرم. دایکیشی دەیگوت وەڵڵاهی سەعید گیان زارای وەستا ڕەسووڵی جارێ منداڵە تۆ پەلە دەکەی! هیچ مەلایەك لەترسی سەبت ناوێرێ مارەی بکات. زڵەخای کچیان دەیگوت دایەگیان زارا لە شەوقە، با تەمەنیشی کەم بێت خۆی ناسیوەو تەواو. ئەوان مشتو مڕی تەمەنی کەمو زۆریان بوو، منیش هەر بیرم لە کەم و زۆری تەمەنی زارا نەدەکردەوە. سجیلی زارام لە گیرفانم دەرێنا چاوم لێکرد، دوازدە ساڵ و چوار مانگ بوو. پوور ئایزێ دایکی سولەیمان گوتی ڕۆڵە کوا کچی تەمەن دوازدە ساڵە سەبت دەکرێ؟ منیش پێمگوت پوور ئایزێ گیان تەواوە بەقەرا ژنی خەڵکی گەورەو لەسەر پێیە، با تەمەنی کەم بێت چەقەیدی هەیە. من ئێستا مارەی دەکەمو سێ چوار ساڵی دیکە دەگاتە تەمەنی قانوونی سەبتی دەکەم.
لەگەڵ سولەیمانی ڕەحمەتی لە کۆڵان ڕاوەستاین زارا هات و دەستم گرتو بە پێیان سێ قۆڵی بەرەو نەغەدە کەوتینە ڕێ.
کەس نەبوو لێی بترسین. نێو دێمان تاقی کردبۆوە، جەلیلی برای زارا لەگەڵ بابی چووبوونە مزگەوتێو تا درەنگانێك نەدەهاتنەوە ماڵێ. هەروەها برای گەورەی لەدێیەکی دیکە بوو.

دایکیشی دەیزانی و بڕێك گریا بوو و ماچی کردبوو، و بۆ شوێنەونکە چووبوە ماڵە جیرانێك. شەودرەنگانێك گەیشتینە نەغەدە ماڵی براکەم. کاکم بەیانی چووە دەفتەری خوا لێخۆشبوو حاجی مەلا ساڵحی ڕەحیمی کە بزانێ چۆنیەتی مارەکردنەکە چی لێدێتەوە. چونکە بەبێ زانیاری حاجی ماموستا مارەکردن لە شوێنێکی دیکە نادروست بوو، هیچ کەس بەبێ زانینی ناوبراو نەیدەتوانی بەبێ سەبت، ژن مارە بکات. ماموستا لەگەڵ کاکم دۆست بوو، کاتێك سجیلی زارا دەبینێ، بەکاکم دەڵێ؛ ئەوە بڤەیە، نابێ لێرە مارە بکرێ چونکە دەوڵەت بزانێتەوە بەتاوان دەژمێردرێ، بەڵام من مەلا حیسامالدین دەنێرم لە ماڵێ خۆتان مارەی بکاو لەلای ئێوەش نهێنی بێت. مەلا حیسام کارمەندی دەفتەری حاجی مەلا ساڵح بوو. لای ئێوارێ هات لە ماڵی کاکم بە نهێنی زارای لە من مارە کرد.

## ڕۆیشتن بۆ مهاباد

کاکم عادەتێکی هەبوو ئەگەر بۆخۆی حەزی لە شتێك بایە دەیکرد. چڵەوکەبابیەکی زۆر چاکی لە باشترین شوێنی نەغەدە هەبوو کە فرۆشتیو بڕیاری دا ماڵەکەی بەرێتە مەهاباد. منیش دەبوایە لەگەڵی بڕۆم. نیزیك ساڵێك لەوێ بووین. ڕۆژێك کەریم حیسامیو هاشمی حوسێنزادەو یوسفی ڕزوانی کە پێکەوە دوکانیان هەبوو، و وادیار بوو بەرپرسی کارو باری حیزبی دێموکڕات لە مەهاباد بوون، بانگیان کردم و پێیان ڕاگەیاندم کە بڕیاری حیزبە دەبێ بچیەوە نەغەدەو لە گەڵ کاك ئەحمەد ئاسنگەر پێوەندی بگری، ئەو پێت دەڵێ کارەکانت چییە. دەست بە کاری حیزبی دەکەیو بۆ مەسەلەی ژیانیش تۆ بۆ خۆت هێندێكو حیزبیش هێندێك یارمەتیت دەدا.

زۆرم پێناخۆشبوو. کارم پەیداکردبوو، ژیانێکی خۆشمان پێکەوە نابوو، بەڵام پێم وابوو ئەگەر فەرمانی حیزب بەجێ نەگەیەنم گوناهێکی گەورەم کردووە. روژێك بە کاکم گوت، فەرمانی حیزبە من دەبێ بچمەوە نەغەدە. گوتی سەعید منیش لەو ساباڵغە وەڕەز بوومە دێمەوە نەغەدە. دووبارە بارمان کرد هاتینەوە نەغەدە. خانوێکی سێ و چواری بەگڵ دروستکراو کە سپیکاریش نەبوو لە دوکتور لوتفیم گرت مانگێ بە دە تمەن. دوو بە دوو منو زارای هاوسەرم لەو خانووەدا دەژیایین.

لەسەر ڕاسپاردەی هاوڕێیانی حیزبی سندوقێکی چەرچیەتیم بە دروستکردن داو، وەك چەرچی هێندێك شتم دەکڕی وەکوو دەرزیو دەزوو، بنێشت و سابونو ئاوێنەو...

ئەو دێیانە دەچووم کە ئەندامی حیزبی لێبوون، هەر ئەوانیش خانەخوێم دەبوون. دوای ئەوەی چەند ماڵێك دەگەڕام و هێندێکم سەودا دەکرد، دەچوومەوە ماڵی خانەخوێو پێکەوە پلانی دانیشتنمان لەگەل شانەی ئەندامانی ئەوێ بۆشەوێ، یان ڕۆژێکی دیکە دادەرشت. هەشت نۆ ڕۆژێك لەو نێوە دەسووڕامەوەو هاوڕێیانی ئەندامم دەدیت و پاشان دەچوومەوە نەغەدە و ڕاپۆرتی مانگانەی کاری خۆم دەداوە بە کۆمیتەی شار.

لەباری فرۆشتنی ئەو شتانەی پێم بوو، قازانجێکم دەست دەکەوت کە دەکرێ بڵێم نیوەی ژیانمی دابین دەکرد.

## مەسەلەی مەسڵەت (صلح)!

ئێمە کەهاتینەوە نەغەدە دەبوایە لەگەڵ ماڵە بابی زارا مەسڵەت بکەم. زارا دوو براو دایك و بابی هەبوو. بابی لەبەر پیری کوێر ببوو. کوڕەکانیشی خەریکی شوانی و کرێکاری بوون. من لێیان نەدەترسام، بەلاّم لە کوردستان عەیبێکی گەورە بوو ئەگەر مرۆڤ کەسانێك نەنێرێت بۆ مەسڵەت کردن. لە کوردستان کولتووریش وایە، یان دەبێ پووڵت هەبێ، یان خوشك یا خزمێکت هەبێ مەسڵەتی پێ بکەی. منیش هیچم نەبوو، نە پووڵ، نەخوشك. دوو خوشکی لەخۆم گەورەترم هەبوو ئەوانیش مێردیان کردبوو. هیچ خزمێکیش ئامادە نەبوو کچ و خوشکی خۆی بۆ من بەرخوێن بدات. فەرهەنگی کوردستان وایە، کاتێك کچێك یان ژنێك هەڵدەگیرێ ئەگەر بەپارە مەسڵەت نەکرا، یان خاوەن کێشەکە پووڵی نەویست، دەبێ کچ بدەی. جا ئەو کچە خوشك بێ، یان کەسێکیتر، پێیدەڵێن بەرخوێن. منیش بەرخوێنم نەبوو، بۆو مەسڵەتە نەمدەزانی چیبکەم!

کاکم واتە برای گەورەم پیاوێکی ئاقڵو جێگای ڕێزی خەڵك بوو، پێی گوتم دووسێ کەسم ڕاسپاردوە بەبراکانی زارایان گوتووە، مەسڵەت بکرێ باشە، با دوژمنایەتی لەوە زیاتر پێك نەیە. ئەوانیش وەلاّمیان هێناوەتەوە، گوتوویانە ئێمە دەزانین سەعید هیچی نییە خاتری ئێوە بێ. بابێنە ماڵێ ئەوەی ڕوویداوە بەئێوەی دەبەخشین.

دوابەدوای ئەو وەلاّمە ئێمەش شەوێك کەیخوداو ڕیش سپیمان کۆ کردەوەو چووینە ماڵیانو زۆر بەچەورو شیرنی مەسڵەت کراو بڕایەوە. ئیتر ئەوجار ڕێگامان بۆ ماڵی بابو براکانی زارا کرایەوەو هاتوچۆیەکی زۆر گەرممان پێکەوە هەبوو.

## مەگیرانی زارا!

دایکی زارا کەنێوی حەلیم بوو، باجی حەلمە، نەنە حەلمە و پوورە حەلمەیان پێدەگوت. زارا پێشنیاری کرد رۆژێك بچین سەردانێکی ماڵە بابی بکەین. پێکەوە هەستاین چووینە ئاڵیاوێ. ڕۆژێکی نەنە حەلمە دایکی زارا پێی‌گوتم:

ـ ڕۆڵە سەعید با من شتێکت پێ بڵێم، تۆ دەزانی زارا مەگێرانی دەکات؟ ڕۆڵە سەعید گیان، زارا شەرمێونە لە ڕووی هەڵنایە لەلای تۆ باسی بکا. تۆ دەبێ ئاگات لێبێ. زارا لە دەرێ بوو کە هاتەوە ژوورێ لە لای دایکی دەستم لە ملی کردو پێم گوت کەڵەك‌باز تۆ مەگێرانیت دەکرد بۆیە زوو زوو دۆکلێوت لێدەنا؟! زانی دایکی بۆی گێڕاومەتەوە، پێکەنی‌و سەری بەرداوە. لەڕاستیدا زارا شەرمی لەمن دەکرد پێم بلێ مەگیرانی دەکا.

لە ڕۆژەکانی هەوەڵی ژیانی هاوسەریماندا، زارا پێی عەیب بوو پێم بلێ سەعید. هەرکاتێ کارێکی هەبایە، کەبانگی دەکردم دەیکوت ئەرێ ئەوەی ناکەی یان ئەرێ...

رۆژێك پێم گوت تۆ دەزانی من نێوم ئەرێ نییە و نێوم سەعیدە، تۆش نێوت زارایە. زۆر پێکەنی‌و گوتی ڕاست دەکەی، بەڵام من لە دێ بەتۆم دەگوت کاك سەعید، مەلا سەعید، میرزا سەعید. ئێستا بۆم نایە سەعیدی ڕووتت پێ بڵێم.

دوای وتووێژێکی زۆر، دیسان بە ئەرێی بانگ دەکردم. دوایی پێم چەقاندو گوتم دەبێ لەسەریەك چەند جار بڵێی سەعید، سەعید، سەعید! ئیتر لەو ڕۆژە ڕا بڕیاری دا، بە نێوی سەعید بانگم بکا و واز لە ئەرێ بێنێ!

زارا لەگەل ئەوەیدا لەژنی ئاسایی کەم تەمەن‌تر بوو، هەروەها ژنێکی نەخوێندەواری زۆر سادەو ساکاریش بوو، لەوەش زیاتر، لە نێو خوڕافاتی ناوچەدا غەرق ببوو. من لە پێشدا هەوڵم دەدا

ئەو شتانەم لە بیر دەبردەوە کە لە مێشکیان ئاخنی بوو. چوار پێنج مانگ خەریك بووم ئەو شتە پڕو پووچانەی کە لەنێو خەڵکی ئاساییدا باو بوون، بۆ لەبیر بردنەوەی کارم لە سەرکرد. ڕاستە منیش لاوێك بووم، بەڵام من بەهۆی هاتو چۆی کادرەکانی حیزب لەزۆر شت ڕوون ببوومەوە، ئەسڵەن مەزهەبم لەبیر چووبۆوەو ئەو مەلا سەعیدەی وەك کوڕە مەلایەك سەرچۆکی پاتۆڵەکەی بەنوێژانەوە دڕا بوو، ئەوە نەمابووم و گاڵتەم بە ڕابردووی خۆم دەهات. زارا چونکە بڕوای بەمن بوو، لە سەر مەسایلی خەڕافیات زۆر زۆر زوو ڕوون بۆوە.

دەربارەی خۆی دیارە ناکرێ مرۆڤ هەموو شتێك بنووسێ، من لە ماوەی چوار پێنج ساڵدا گۆڕانێکی چاوەڕوان نەکراوم بەسەردا هاتبوو. زارای هاوسەرم لە ماوەی چەند مانگێکدا لەباری ڕوونبوونەوە زۆری فەرق نەبوو لەگەڵ من. لەڕاستیدا بەو ماوە کورتە ببوو بە مرۆڤێکی تەواو ڕووناکبیر.

من هەمیشە لە وتووێژدا، لەدانیشتندا لەگەڵ خەڵك‌و لە هەموو شوێنێك شانازیم پێوە دەکردو خۆم بەسەربڵند دەزانی کە هاوسەرێکی ئاوام هەیە.

## نۆبەرەی بنەماڵە

بەگوتەی کوردەواری زگی زارای هاوسەرم گەیشتە نۆمانگەو نۆڕۆژەی خۆی‌و مزگێنیان دامێ زارا کوڕێکی بوو. دەمێك بوو پێکەوە بڕیارمان دابوو ئەگەر کوڕ بوو نێوی لێ بنێین سەلاحەدین‌و بەنێوی سەلاحەدینی ئەیوبی بکەین. هۆی ئەو نێونانەش ئەوە بوو کەمێکمان مێژوو خوێندبۆوە کە سەلاحەدین ئەیوبی کورد بووەو... منیش کوردایەتی پاڵی پێوەنام ئەو نێوە عەرەبیە بۆ کوڕەکەم هەڵبژێرم، چونکە سەلاحەدین کورد بووە.

زۆرکەس نێوی عەرەبی لە کچو کوڕی خۆی دەنێ، بەتایبەتی لەڕۆژهەڵات. دیارە باو کردنی ئەو ڕەوشە لە نێو کۆمەڵگای ئێمە، تاوانەکەی دەکەوێتە سەر مەلاو پێشڕەوە ئاینیەکانمان، کە جارێك پێیان نەگوتین عەرەب بەخاتری وڵاتخوازی خۆیان نێوی وایان هەڵبژاردووە، ئێمە بۆ چاو لەوان بکەین!
بەڕاستی مرۆڤ کە بیری لێدەکاتەوە، پێی شەرمە هێندێك لەو نێوانە لە سەر منداڵی خۆی دابنێ، بەڵام بۆ ئیسپاتی عەرب بوونی خۆیان ئەو کارەیان کردووە.
کورد بۆخۆی ئەو هەموو نێوەجوانەی هەیە بۆ دەبێ ناچاربێ بە نێوی لاوەکی منداڵەکەی بانگ بکات؟! منیش ئەوکات بیرم لێنەکردبۆوە، بۆیە ئەو نێوەم هەڵبژارد.

## هەستکردن بە مەترسی!

ڕۆژێك وەستا ئەحمەدی ئاسنگەر ئاگاداری کردم کە شەوێ کۆ دەبینەوە. شەوێ چوومە ماڵی وەستا ئەحمەد و وردە وردە ئەندامانی کۆمیتەی شار هاتنە وێ. کۆبوونەوە ڕاگەیەندرا. بەشداران بریتی بوون لە وەستا ئەحمەد ئاسنگەر، سەدیق عەلایی، سادق کاوە، مەشەدی حەسەنقوڵی، خەلیل سەدیقی و سەعید کاوە. دیارە ئەو کۆبوونەوە بۆیە پێك هاتبوو کە یەکێك لە کادرەکانی حیزب واتە هاشم ئەقەللولطلاب کە بە قادر شەریف بانگ دەکرا، هاتبوە لای ئێمە.
سەرەتا کاك ئەحمەد ئاهەنگەری لەبارەی کۆبوونەوەی ئەو شەوە قسەی کردو ئاماژەی بەکاك قادر شەریف کرد کە لەسەر داوای ناو براو کۆبووینەتەوە.
کاك قادر دوای ڕیزە وتارێك لەسەر ئازادیخوازیو خەباتو تێکۆشانو هەروەها چۆنیەتی هەواڵی نێونەتەوەیی، هاتەسەر

ئەوەی کە بەهۆی هاتنە پێشی ڕووداوێکی ناخۆش، بەپەلە خۆی گەیاندۆتە نەغەدە تا لەنیزیکەوە ئەندامانی کۆمیتە ئاگادار بکات. ناوبراو گوتی:

– هاوڕێیان! بەداخەوە دوو ڕۆژ لەوە پێش حوسێن، (مەبەستی سمایلی قاسملوو بوو کە نێومان گۆڕیبوو بە حوسێن) لە نیزیك شاری بانە ژاندارم گرتویانەو ئێستا ڕوون نییە هەر لەبانە زیندانییە، یان بۆ شوێنی دێکە بەڕێکراوە.

حوسێن کە لەگوندی... وەڕێ کەوتووە، خاوەن ماڵەکە گوتوویە دوو کتێبی سیاسیو هێندێك کاغەزی نووسراویشی لە جانتاکەی دابووە. کاك قادر ئەوەشی لێ زیاد کردو گوتی حوسێن هەمیشە دوو سێ کتێبی بۆ خوێندنەوە پێبووە، ئەهڵی موتالعەیە.

دیارە کتێبی قاچاغیش جورمەکەی زیندانە، بەڵام وەك بەڵگە ترسمان هەیە لەژێر شکنجەدا شتی پێ ئاشکرا بکەن. حوسێن بێجگە لێرە، لە سەرانسەری کوردستان ئەندام دەناسێ و جێگای نیگەرانییە.

تا ئەو کاتە هەمووومان ببووینە گوێو هیچمان نەدەگوت. ئەو هەواڵە هەمووومانی نیگەران کرد. هەرکەس پرسیارێکی دەکردو وەڵامی وەردەگرتەوە. زوو زوو دەمانپرسی باشە ئێمە چبکەین؟ حوسێن هەمووومان دەناسێو سەفەرمان لەگەڵ کردووەو نانمان لەگەڵ خواردووە. وەڵام هەر ئەوەبوو کە وریابین و لە جاران وریاتر کارەکانمان بکەین. سەرتاسەری کوردستان کۆمیتەو شانە بەندییە، ئەو هەموو خەڵکە بۆ کوێ بچێ و لە کوێ خۆی بشارێتەوە. هەرکەس بە شتێك دڵی خۆی خۆش دەکرد.

ئی وابوو دەیگوت نابابە ئەو حوسێنەی دەیناسم ئێعتڕاف ناکات! حوسێن خۆڕاگرە! حوسێن مرۆڤێکی بە بیرو باوەڕەو هەرگیز ئێعتراف ناکات! ئێمە لەناچاریان بەو قسانە دڵی خۆمان خۆش دەکرد. لە بیرمە تا سەعاتی یەکی نیوەشەو

دانیشتین. زارمان وشك ببوو، پێم وایە توانای ڕۆیشتنەوەمان نەبوو. من بەشبەحاڵی خۆم زۆر دەترسام، شکنجەی ساواکم بیستبۆوە کە چەندە سامناکە. من هەر بۆ سبەینێ خۆم گەیاندە ئاڵیاوێ خانوێکم پەیداکردو بارم کرد چوومەوە دێ. زارای هاوسەرم پرسی بۆ ئاوا بەپەلە بێ ئەوەی پێشتر باسی گوێزتنەوە بکەی بڕیارتدا بچینەوە ئالیاوێ؟

من دەبوایە هەموو شتێك بۆ زارا باس بکەم. پێی بڵێم ئەگەر گیرام چی بکات؟ پێی بڵێم ئەگەر نهێنی بووم چی بکات، یان ئەگەر مەئموور ڕووی لە دێ کرد چ کارێك بکات. دانیشتین بەوردی هەموو شتێکم بۆ گێڕاوە. پێم گوت حوسێن گیراوە. زارا حوسێنی دەناسی زۆرمان میوان دەبوو. زارا دەیزانی حوسێن کادری حیزبە. لە هەموو کارو کۆشش‌و هەڵس‌و کەوتی من ئاگادار بوو. زارا دەیزانی من کە شەوو ڕۆژ ڕاناوەستم خەریکی چیم‌و چیدەکەم. زارا زیاتر لە ئەندامێکی حیزبی شتی دەزانی، دەیان کۆبوونەوەی لە ماڵی خۆماندا دیتبوو، قسەو باسی هەموو کۆبوونەوەکانی گوێ لێدەبوو. وەکوو ژنە کادرێك مەحرەمی ڕازم بوو. زارا چاوی تێبڕیبووم پێموابوو بیر لەوە دەکاتەوە ئەگەر من بگیرێم یان بڕۆم ئەو دەبێ چبکا؟ پێم گوت مەترسێ بزانین چۆن‌دەبێ. زارا گوتی تۆ لەبیری مندا مەبە. ئەوە ماڵی بابم لێرەیەو پەنایەکم هەیە. بیر لەوە دەکەمەوە تۆ دەبێ چبکەی؟

پێم گوت ئەگەر بزانم دەگیرێم هەڵدێم بۆعێراق، پاش دابین کردنی جێگاو ڕێگایەك بەنهێنی دێمەوە تۆ لەگەڵ سەلاحەدین دەبەمە لای خۆم. دووسێ مانگێك بەسەر گیرانی حوسێن واتە سمایلی قاسملوودا تێپەڕیبوو، کە ڕۆژێك لەلایەن کۆمیتەی شاری نەغەدە بانگ کرام. بەزارام گوت ئەو شەو کۆبوونەوەیە و دەبێ بچمە نەغەدە. ئێوارێ وەڕێکەوتم بۆ شەوێ چوومە نەغەدە. ئەو کۆبوونەوە بۆ قادر شەریف و کەماڵی سوڵتانی تەرتیب درابوو کە

بۆ سەردانی کۆمیتەکان و کاری تەشکیلاتی ناوچە هاتبوون. بە بەشداری ئەوان کۆبوونەوە دەستی پێکرا. ئەوەڵ پرسیار ئەوە بوو، چ هەواڵێکتان لەسمایلی قاسملوو هەیەو لە کوێیە؟
زۆر بە خۆشحاڵی گوتیان حوسێن لە زیندانی قەسر لە تارانەو تا ئەو جێگایەی هەواڵمان هەیە، تا ئێستا وەك شێر خۆی ڕاگرتووەو ڕاوەستاوە. دیارە زۆر شکەنجە کراوە بەڵام هیچی نەگوتووە. ئێستا ئەو شکەنجە قورسەی پێشووی لەسەر نەماوەو جێگای ترس نییە.
ئەو قسەیە بۆئێمە خۆشترین هەواڵ بوو. برادەران ئەو قسەیان چۆن سازکردبوو، یان لەکوێیان بیستبوو، بۆئێمە جێگای پرسیار نەبوو. ئێمە بە تەواوی باوەڕەوە ئیمانمان پێیان بوو. یان ئەگەر درۆشبایە ئێمە لە کار کردن بەولاوە ڕێگایەکمان نەبوو. بۆ بەرپەرچدانەوەی پیلانی ساواك جگە لە چاوەڕوانی قەزاوقەدەر، هیچ نەدەکرا. هەرچەند ڕێکخراوێکی شۆڕشگێڕی نهێنی نابێ هەڵسوکەوتەکان بەقەزاو قەدەر بسپێرێ، بەڵام لە هەل و مەرجێکی ئاوادا با باوەڕیش بە قەزاوقەدەر نەبێ، چڕێگاو تێبینیەکی دیکە هەیە مرۆڤ بیکاو دووسێ هەزار کەس لە گیران و ئاشکرابوون رزگار کات!

## دارە دارەی سەلاحەدین!

کاتێك هاتمەوەو ئەو هەواڵە خۆشەم بۆ زارا هێناوە، ڕەنگێکی هێناوبرد، دەتگوت دنیایان پێ بەخشی. لە خۆشیان پێدەکەنیو سەلاحەدینی لە باوەش دەگرت و زوو زوو ماچی دەکرد.
سەلاحەدین دەورانی دانیشتنو گاگۆڵەی ڕەت کردو بە وتەی خۆماڵی گەمەی خۆش کردبوو، بۆخۆمان پێی حاوا بووینەوە. ئەو شەوەمان بە خۆشیو پێکەنین سێ قۆڵیی بردەسەر. دیارە

هەواڵی خۆڕاگری حوسێن خۆش بوو بەڵام نەشدەکرا نەترسین‌و گیرانی حوسێن هەڕەشەمان لێ نەکات، تا چارەنووسی ئاوا تەماوی بێ و لەزیندان مەلاقاتی نەبێ، ئێمە هەردەم لەژێر هەڕەشەدا بووین. کۆمیتەی شار مۆرو دەفتەری ئەندامان‌و بایی دە دوازدە هەزار تمەن بەڵگەی یارمەتی هێنا ئاڵیاوێ‌و لەلای منیان دانا. منیش دام بەزارای هاوسەرم‌و پێمگوت ئەگەر دیتت ماشێن بۆلای دێ هات، تۆ گورج ئەوانە بەرە لە نێو قەڵاغی جیرانەکەمانی باوێ دوایی دەچین دەیهێنینەوە.
ئەو دەم هاتوچۆی ماشێن کەم بوو. مانگی جارێك ماشێنێك نەدەهاتە دێ، دەمزانی ئەگەر رۆژێك بیانەوێ بێنە ئاڵیاوێ، بە ماشێن دێن.
لەو کاتەدا من برازنە خەجیجی هاوسەری کاك کەریم حیسامیم بردبوو بۆ گوندی گولاوی ماڵی کوێخا... کە ئەویش لەوێڕا بەڕێی بکات بۆ کوردستانی عێڕاق بۆلای کاك کەریم. کاك کەرێم دووساڵ بوو لە مەهاباد هەڵاتبوو بۆ ئەوەی نەگیرێ. بۆسبەینێ بەیانی کە من دەگەڕامەوە بێمەوە ماڵێ، بێخەبەر بووم لەوەی کە ڕۆژی پەلامارو گیرانە.
زارا بۆی گێرامەوە گوتی دەگەل ژنان دەچووین بۆ تەپاڵان، بە خۆم گوت بۆ ئەو مۆرو بەڵگانە لەگەڵ خۆم نەبەم بۆمەزرایە؟ گوتی هەڵمگرتن‌و لە نێو سەوەتەکەم هاویشتن و ڕۆیشتین، گەیشتینە بەرماڵان تەپوتۆزی ماشێنێك پەیدا بوو. زارا کە دەبینێ ماشێنێك بەرەو ئاڵیاوێ دێت، بە گورجی لەوێ لە زەویەکی کێڵدراو بەچیلکەیەك قوڵکێك هەڵدەقەنێ‌و مۆرو ئەو شتانەی پێی دەبێ تێداوێ.
زارا گێڕایەوە، کە گەیشتنە نێو دێ پیاوێك بە نێو منی بانگ دەکرد. کە چومە پێش ئەفسەرێك‌و پێج شەش ژاندارم لە بەر دەرگا ڕاوەستا بوون. پرسیان سەعید لە کوییە؟ کوتم چۆتە

شاری. ئیتر ماڵەکەیان بە گەڕان بە سەرە نێزە کون کون کرد بوو. کابرای ئەفسەر (کە دوایی ڕوون بۆوە سەرهەنگ زیبا بووە) هەر زوو زوو تەرازووەکەی هەڵدێناو دەیگوت: "سعید دوکاندار است با یك لنگە ترازو" تەرازووەکە لینگێکی لەوێ نەبووە! مەبەستی ناوبراو ئەوە بووە کە ئەو دوکانە تەنیا بۆ سەرپۆشی کاری سیاسییە، دەنا بەلینگە تەرازوێك دوکانداری ناکرێ. دیارە سمایلی قاسملوو کە ئیعترافی کردووە باسی چەرچیەتیو وردەواڵە فرۆشی منیشی کردووەو گوتویەتی وەك چەرچی دەگەڕێو کاری تەشکیلاتی دەکا. بەهەر حاڵ کاتێك هیچ شتێك نابیننەوە، کوێخا بانگ دەکەن و بەڵێن نامەی پێ ئیمزا دەکەن کە هەر کاتێك سەعید هاتەوە دەوڵەت ئاگادار بکا.
منیش بێهەواڵ لە پیرانشار سواری ئوتوبوسی نەغەدە بووم هاتمە نەغەدەو لەکاڕێژ دابەزیم. کە دابەزیم هاوڕێ حەسەنقوڵی ئاماژەی بۆ گۆشەیەك پێکردم. هاتە پێش و گوتی مەچۆ نێو بازار، ئەورۆ بەیانی کاکتو وەستا ئەحمەدو سەدیق عەلاییو ئەسەد نووریو کەریم لێتانو مەولود لێتان و زۆرکەسی دیکە گیراون. هەروەها چوونەتە ئاڵیاوێ تۆ بگرن لەماڵ نەبوویە. نابێ بچیەوە دێ و مەچۆ نێو بازاریش با نەت بینن، خودا حافیز! منیش بە کوچەو کۆڵان و بە نێو زەویاندا ڕێگای ئاڵیاوێم گرتە پێش و خۆم گەیاندەوە ماڵێ.
زۆر نارەحەت بووم، قسەم بۆنەدەکرا. زارا زوو زوو بە قسەی ژنانە دڵخۆشی دەدامەوە، دەیکوت کوڕە خۆ تۆ پیاوت لە دەست زایە نەبووە. لەسەر دزیو تریاك فرۆشتن لێت ناگەڕێن بتگرن، هەوڵبدە نەگیرێی تابزانین گیراوەکان چیان بەسەر دێ. تۆ هۆشت بێنەوە بەرخۆت چارێکی خۆت بکە، بۆ من و سەلاحەدین هیچ نیگەران مەبە. زۆری دڵخۆشی دامەوە، بەڵام من بەو

قسانە سوکناییم نەدەهاتو دەمزانی ئەگەر بگیرێم هەموو ئاوات و خەونەکانم تێك دەچن.
پێشتر ئامازەم بە گیرانی کاکم کردووەو چۆنیەتی دەست بەسەرداگرتنی ئەو پارەی پێی بووەو لێیان گێڕاوەتەوە کە بێ بە قسەی خۆش منیان بۆ بەرێ، کاکم بەخۆسادە پیشاندانو قەول دان، وا دەکا ماوەی ٢٤ کاتژمێری ئیزن بدەن کە بێتەوە من لەگەڵ خۆی بەرێتە ساواك.
منیش ئەو ڕۆژە عەبدوڵڵا دوکلاوی زاوام بۆ وەرگرتنی هەواڵ ناردبووە نەغەدە، کاتێك کاکم دەزانێ من لە ئاڵیاوێم، لەگەل عەبدوڵڵا بۆ ئاڵیاوێ وەڕێ دەکەون. شەوێ کاتێك گەیشتنێ، کە منی دێت دانیشتووم خەریکی چاخواردنەوەم، هەر وەك شێتانی لێهاتو بە تووڕەیی گوتی تۆ چۆن بێفکرو خەیاڵ ئاوا خاترجەم دانیشتووی؟ تۆ دەزانی وەك چاوێشەدار لێت دەگەڕێن؟ هەستە بابڕۆین! بە خوشکمی گوت دادەی ئایشێ دووسێ نانمان بۆدانێ لەڕێگا دەیخۆین. کاکم ئەوەندە لەو گیرانە و ئیدارەی ساواك ترسا بوو، سەری لە منیش شێواند کە لەگەڵ زارای هاوسەرم دانیشم پێی بڵێم چی بکات، یان ئێمەی سەر لێشێواو چ دەکەینو بۆکوێ دەچین،. هەرچەند نەماندەزانی چ دەکەینو بۆکوێ دەڕۆین. زاراو من چاومان تێك بڕیبوو نەماندەزانی چ شتێك پێك بڵێین. ئەو خەمی منی بوو کە تووشی ئەو ڕووداوە ببووم، منیش خەمی ئەو و کوڕەکەم بوو کە چیان بەسەر دێتو چارەنووسیان بەکوێ دەگا. تەنیا ئەوەندەم پێگوت؛ زارا نیگەران مەبە لەهەر شوێنێك بم بێهەواڵت ناکەمو دەتبەمە لای خۆم. خودا حافیزیمان کردو بەرەو ناوچەی شنۆ وەڕێکەوتین. لەڕێگا بە دەم نانخواردنەوە قسەمان دەکرد.
سەرئەنجام بەوە گەیشتین کە چەند کەسێك لە ئەندامانی حیزب ببینین و وێڕای هێندێك ئاگاداریو نهێنیکاری، عەلامەتی

ڕەمزیان لەگەڵ دانێین بۆئەوەی دوای ئێمە جاسووسو فسۆس لە نێویاندا نفوز نەکا.

حەوتوویێك لە ناوچەی شنۆ بووینو ڕۆژێ جارێك هاوڕێیەکمان دەنارده نەغەده بۆ وەرگرتنی هەواڵێك لە گیراوەکان. هاوڕیانی نەغەدەش ڕایاندەسپارد کە بڕۆن دوور بکەونەوە با نەگیرێن. دیارە ئەوانیش ناحەق نەبوونو ترسی خۆیان هەبوو کە نەوەکو بگیرێین و بەهۆی شکەنجە ئەوانیش تووشی دەردەسەری بکەین. برادەرانی ناوچەمان ڕاسپارد کە کەسی شارەزامان بۆ ببیننەوە ئاوای کوردستانی باشوور دەبین، دەچین و دەبینە پەنابەر. سەید وەفای سەردەرێ و مەلا مەحمودی ئاخشی نەرزیوێ پێیان گوتین کەسێك بە نێوی واحید مەلا تۆفیق کە پێشتر لە عێراق بووە، ئێستا دەگەڕێتەوە عێراقو پێمان گوتووە سبەینێ ناوبراو لەگەل خۆتان دەبات. هاوڕێیەکمان هەبوو بەنێوی وەستا ڕەسوڵی جبریلاوێ ئەندامی کۆمیتەی ناوچەی شنۆ بوو، پێم گوت بچۆ بۆ ئاڵیاوێ بە زارای هاوسەرم بڵێ هیچ چارمان نییە بێجگە لە وەی ئاوای دیوی عێراق بین. بابزانین لەوێ چمان بەسەر دێ، فکرێکیش بۆ ئەو و سەلاحەدینی کوڕم دەکەمەوەو دەیانبەمە عێراق.

وەستا ڕەسووڵ ڕۆیشت ئیتر ئێمە نەمانتوانی گیربین، ڕۆیشتینو ئێستاش وەستا ڕەسووڵم نەدیتەوە لێی بپرسم بزانم چیکردووەو چیپێگوتوون. پاشی شەش حەوت ساڵ کە هاتمەوە، ویستم ببینم گوتیان کۆچی دوایی کردووە. ڕۆوحی هەرشاد بێ زۆری زەحمەت کێشاوە بۆ حیزبی دێموکڕاتو نیشتمانەکەی کوردستان.

## ڕۆیشتن بۆ باشوور!

من و کاکم لەگەڵ واحیدی مەلا تۆفیق پارشێوی هەستاین‌و ماڵاوایییمان لە کاك مرادو بنەماڵەی کرد لە گوندی قەڵاتیان. ناوبراو بە مراد پەتك نێودێر کرابوو. تا ئەو کاتەی کە ئەو دێڕانە دەنووسم نازانم ماوە، یان نا؟ یادی بەخێر بێ، سوپاس بۆ هەموو پیاوەتی‌و ئەو زەحمەتانەی کە لەو ماوەیەدا لەگەڵ ئێمەی کێشا.

هەورازی کێلەشین‌مان دەبڕی‌و جاروبار ئاوڕم دەداوە. خەمی زاراو سەلاحەدینی کوڕم گەرووی وشك هەڵێنا بووم. بە قسە یاخۆ بە نووسینی ڕستەو پاڕاگڕافێك دەربڕینی هاسانە، بەڵام بەجێ هێشتنی منداڵێک و ژنێك لەماڵی بابی، هەرگیز وەڵامدەری ئەو بەر پرسایەتییەی کە پیاوێك لە بەرابەری هاوسەرێکی کە خۆشەویستییەکەی لەگەڵ خوێنی تێکەڵبووبێ، نییە! هەوەڵ جار بوو زارای هاوسەرم بەجێ دەهێشت، ئەویش بۆ کاتێکی نادیار. ئێمە چووینە عێڕاق و بووین بە پەنابەری سیاسی. نزیك بە هەشت مانگ چوکترین هەواڵم لێیان نەبوو.

خوێنەری بەڕێز! لە نووسراوەی بەردەستتان دا دەمەوێ گوشەیەك لەسەر چۆنیەتی بنەماڵەو فیداکاریەکانی زارای هاوسەرم بنووسم. دیارە مرۆڤی سیاسی هەر چەندی خۆی لە پرسی سیاسی بپارێزێ، ناتوانێ لە تێوەگلانە سیاسیەکان دوور کەوێتەوە. من بمهەوێ‌و نەمهەوێ هەر شتێکی باسی بکەم وەکو هەوێن بەسەرهاتی سیاسیی خۆمی ڕەگەڵ دەکەوێ.

دوای ئەوەی بە پەنابەری سیاسی وەرگیراین، دەوڵەتی عێڕاق لە هاوینە هەواری سەلاحەدین کاری داینێ. دیارە هەمووومان سەڵت بووین، پاش نیوەڕۆیان کە لە کار تەواو دەبووین لە دەوری

یەکتری کۆ دەبووینەوە. جاروبار دەکەوتینە شۆخی و پێم دەگوتن هەر بینا سەلاحەدینی کوڕم ڕێگای داگرت هاتە لام! ڕۆژێك کە وامگوت، کاکم فرمێسکی هاتەخوارو هەستا ڕۆیی. من پێم وابوو خەمی منیەتی بۆیە گریا. بۆشەوێ دەستم لە ئەستۆی کاکم کردو دڵخۆشیم داوە. کاکم گوتی پێم خۆشە بەیانی برێکت قسە لەگەڵ بکەم. بەیانی لەبن دارێك دانیشتین و کاکم دیسان دەستی کردەوە بەگریان. دیسان من دڵخۆشیم داوە. دەستی لەملم کردو گوتی سەعیدگیان! تۆخودا شتێکت پێدەڵێم پیاوەتی بکە زۆرخۆت وەڕەز مەکە. دوای بەڵێن لێوەرگرتن دەستی کردەوە بەگریان گوتی؛ سەلاحەدینی کوڕت مردووە. وشـەی مردن زۆر ناخۆش بوو، بەڵام بۆئەوەی کاکم ناڕەحەت نەبێ پاش پشوویەکی کورت گوتم ئەتۆ سەلامەت بی کاکە گیان، منداڵەکانت سەلامەت بن. دوایی کە چوومەوە سەر کارەکەم لەوێ تەواوێك گریام. لە چوار پێنج جێگایان کاکم گوتبووی من زۆر مەمنوونی سەعیدم کە ئەو خەبەرەم دایە، بۆ وەی من ناڕەحەت نەبم، نەگریا. کاکم زۆر بە ڕوحمو دڵناسك بوو، لە مێژ نەبوو هەواڵی مردنی ژنەکەی پێگەیبوو، ئەو هەواڵە زۆری وەڕەزو ناڕەحەت کرد بوو.

بەڕاستی هەواڵی سەلاحەدین وای لێکردم دووچەندان خەمباری زارای هاوسەرم بم. بە کاکم گوت بەڵکوو ڕێگایەك ببینیەوە زارا بێنم، هەر چەند پێم وابوو دایك و بابی ئیزنی نادەن بێتە لام.

لەو سەرو بەندەدا برادەرێك بە ناوی مەلا قادری لاچینی هاتە مەسیف سەلاحەدین. ناوبراو لە دەورو بەری ئەوێ دەیخوێند، کەزانیبووی کوردی لای ئێرانی لێیە هاتە لامان. زوو حاڵی بوو کە ئێمە لە بیری چیداین و چیمان دەوێ. مەلا قادر کوڕێکی خوێن شیرن بوو. یادی بەخێربێ بۆخۆی پێشنیاری کردو گوتی ئەگەر دەزانی ژنەکەت دێ، من قاچاغ نیمو دەتوانم بچم بۆت

بێنم. ئێمە شتێکی ئاوامان لە خودا دەویست. ناوبراو ڕۆیی حەوتوویێکی پێ چوو زارای هاوسەرمی گەیاندە مەسیف سەلاحەدین. ئێتر لەوکاتەوە لەگەڵ مەلا قادر بووین بەهاوڕێ و برادەر، تەنانەت بووین بە هاوڕێی حیزبیش. بۆ پایزێ کارەکەیان لێ ئەستاندینەوە. لە هەولێر خانوێکم گرت‌و چوومە ئەوێ. ژیانێکی ناخۆشمان هەبوو، کارم نەبوو، ڕۆژانە دەچووم کەوشی خەلکم ڕەش دەکردەوە، بەحاڵەحاڵ نانە وشکییەکم پێدەکرى. کاکم هێندێکی یاریدە دەدام. لەو لاولا ڕام سپارد کارێکم بۆ بدۆزنەوە. پیاوێك بوو بە نێوی ڕەحمانە شەل، یەکێك لە بەرپرسانی حیزبی شیوعی بوو، کارگای بلووك سازی هەبوو. ناردیانم بۆ وێ، ڕۆژانە بە حەوت پەنجایی کیسە سمیتم دەکێشاوە، هەموو لاملم بە کیسەی چیمەنتۆ سووتابۆوە. بەوحاڵەش هەر ڕازی بووم.

## هەواڵێکی خۆش!

ڕۆژێك زاراکوتی سەعید بەو وەزعە ناخۆشەی کە تۆی تێدای بارێکی دیکەشت هاتەسەر، لێم پرسی چی بووە، گوتی مەگیرانی دەکەم زگم پڕە. من پێکەنیم و دەستم لە ملی کردو خۆشحالی خۆم نیشاندا، بەڕاستیش زۆر خۆشحاڵ بووم. کەزانی پێم خۆشە، دەستی کرد بە دڵخۆشی دانەوەم. زارا لەکاتە تەنگانەکاندا دایم منی دڵخۆشی دەداوە، بەڕاستی قسەکانی هەمیشە قەوەتی قەلبی من بوو. دەتوانم بڵێم ئەو ساڵانەی کە لە شاخ و دەشت و دەر بووین، دڵخۆشیدانەوەکانی زارا ببووە هۆی خۆڕاگرتنی منو زیاتر سوور بوونم لەسەر کوردایەتی. زارا هەمیشە دەیکوت برسیەتی و ڕووتی و هەژاریم پێ هیچ نییە، سەر بەرزی، سەرمایەو هەموو شتێکە.

بەکورتی بەکاری کرێکاری تاڕادەیەك ژیانمان باش ببوو. دوای ماوەیەك کچێکمان بوو نێومان نا شێواو، ئەو شێواوەی کە ئێستا کردوومی بە باپیری پێنج نەوەی خوێن شیرنو جوان. ناوی شێواومان بۆیە هەڵبژارد، چونکە سەرەتای دەستپێکردنی شۆرشی ئەیلوول بوو، لەمێژ نەبوو شەڕ دەستی پێکردبوو. بە هێرش و تەقەی مەحمود کاوانی دوو پاسگای پۆلیس لەناوچەی خۆشناوەتی گیراو شۆرش ڕاگەیەندرا. هێشتا مەکتەبی سیاسی پارتی دێموکڕاتی کوردستان خۆی تێکەڵاوی کاری شۆرش نەکردبوو. مامۆستا برایم ئەحمەد وەك سکرتێری پارتی لە بەغدا خەرێکی کێشە کێشی ئەو نووسین و وتارانە بوو کە لەڕۆژنامەی خەباتدا لە سەر مافی کورد نووسرابوون. بەتاوانی نووسینی مەقالات دادگاییان بۆ دیاری کردبوو، کەبچێتە دادگاو لەسەر ئەو کێشەی لە کوردستان دەستی پێکردووەو شۆرش هەڵایساوە، مەحکومی بکەن و بیگرنو ڕۆژنامەی خەباتی

پێدابخەن. لە بیرمە کە بۆ ڕۆژی دادگایی کردنی کاك برایم ٢٤ پارێزەر نێوی خۆیان نوسیبو کە بۆ بەرگریو پشتیوانی، لەگەڵی بچنە دادگا. ئاکامی دادگایی کردنی مامۆستا برایم ئەحمەد بوو بە هۆی داخستنی ڕۆژنامەی خەباتو هەروەها گوشارێکی زۆر بۆ سەر تەشکیلاتو ئەندامانی بەرپرسی پارتی.
لە ئاکامدا ناچار ئەندامانی مەکتەبی سیاسی و کۆمیتە ناوەندی پارتی پێوەندیان بە شۆڕشەوە گرت و بەغدایان بەجێ هێشتو چوونە شاخ.
ئێمە ماڵمان لە گەڕەکی تەیراوا بوو، ڕۆژێک لەگەڵ زارا و شێواو دانیشتبووین، زارا گوتی دەترسم بەڕێ نەچین دەنا ئێمەش دەچووین لە شۆڕشدا بەشداریمان دەکرد. ئەو قسەیەی زارا منی ڕاچڵەکاند. پێم کوت زارا دادەی ئەو قسە بڵێوە. بە توندیو بە بۆنی گلەییەوە کوتی بۆ منت پێسەیرە؟ ئەدی تۆ لەسەر کوردایەتی قاچاغ نەبوویە، خەبات لێرە بیکەی یان لە وێ، چ جیاوازیەکی هەیە؟ مەبەستی زارا گەرمێنو ڕۆژهەڵات بوو، کەدەیگوت فەرقی چییە؟

پێم گوت زاراگیان تۆم پێ سەیر نییە، ئەو کچەمان لێبۆتە بار، دەنا من لە تۆم پێخۆشترەو شۆرشیش تۆپباران و بۆمبارانی پێوەیە. لەوبارەوە وتووێژێکی زۆرمان کرد. زۆری پێنەچوو کەوتینە هاوینێ و شەوی ١٤ی تەمووز بەعسیەکان بەسەر عەبدولکەریم قاسمدا کودتایان کرد. من لەبازاڕی بووم دوکانو بازاڕ داخران، هەڵات هەڵات دەستی پێکرد. کاتێ هاتمەوە کوتم زارا بەقسەم نەکردی، ئەگەر بە شێنەیی ڕۆیبایین باشتر لە ئێستا بوو!! تۆ هەواڵت وەرگرتووە کودتایان بەسەر ئەو حکومەتە دێموکڕاتیکە داکردو جارێ ئێستا ڕوون نییە داخوا عەبدولکەریم قاسمیان گرتووە یان کوشتووە، ئەوجارە بە ناچاری دەبێ بڕۆین. شاری هەولێر شێوابوو چ شێوانێك، پێشتر ڕەش و ڕووتی عەرەبیان لە هەولێر خزاند بوو وەك چاوێشەدار دەسووڕانەوە. بۆ بەیانی هەر کوردەکە بوو دەگیراو بەلێدانو کوتانو پاڵەپەستۆ وەپێش خۆیاندەدا بەرەو بەندیخانە. زۆربەی هەرە زۆری ئەو گیراوانە برادەرانی حیزبی شیوعی بوون.
دووسێ ڕۆژان وەدەر نەکەوتم، ڕوژ لەگەڵ ڕۆژ شارەکە ئاڵۆزترو ناخۆشتر دەبوو، هەواڵی گیراوەکان بە کوژراوو شکنجەکاری بڵاو دەبۆوە. خەڵك باوەڕی نەدەکرد وا بەفەوری شکەنجە دەستی پێکردبێ، بەڵام پاشان دەرکەوت کەمیش کوتراوە، هەمووی ڕاستە. ئێمە هێندێك شتی بەرچاومان هەبوو بەدەرو جیرانمان فرۆشت، هێندێکیشمان بەجێهێشت. برادەرێکی شیوعی بەنێوی وەستا تۆفیق قەول بوو بۆ دەرباز بوونمان لەهەولێر کەسێکمان بۆ پەیدا بکات، ئەویش ڕۆیشتو نەهاتەوە. نازانم گیرا کوژرا چی بەسەرهات. تا ئێستا زۆریشم پرسیوە کەس نییە بیناسێ . بیرەوەریەکی زۆرم لەگەڵ ناوبراو هەیە و پێم خۆش بوو بیبینمەوە.

## هەولێر بەجێ دێڵین!

دوو برادەری دیکەی نەغەدەیی لەوێ بوون بە نێوی وەستا هەمزەو وەستا خدری خەیات، لەگەڵ ئەوان ساز بووین کە وەدەر کەوین. بەرە بەیانێك زارای هاوسەرمو شێواوی کچم، لەگەڵ سەیزادەی هاوسەری وەستا هەمزەو کوڕەکەی بەنێوی شۆرش، سواری ماشێنمان کردن لە شاری بچنەدەرو لە پشت سەیتەرەی شار راوەستن، ئێمەش پیاوەکان بە پشتی نەخۆشخانەی گەورەدا بە پیادە بڕۆین و لە وێ یەکتر بگرینەوە و بەرەو سەفین کە بنکەی پێشمەرگەی لێبوو بڕۆین. ئەو کات شاری هەولێر وەکوو ئێستا گەورە نەبوو، سەیتەرەی سەر ڕێگای مەسیف سەلاحەدین هەر تۆزێك لەو لای نەخۆشخانە بوو. منو هەمزەو خدر گەیشتینێو سوار بووین بۆ گوندی" گڕاو" کە کەوتۆتە نێوان مەسیف و سەفین.
شەوێ لەماڵی ڕەسووڵی ئاشنام نوستین، بەیانی کە هەستاین کاك ڕەسوڵ بە پێکەنین هاتو گوتی مزگێنی بێ ئەو شەو سەری ڕەش پێشمەرگە گرتوویەو پڕ بووە لە بارزانی. سەردەستەی پێشمەرگەکان شاکر بەگە. شاکر بەگ برادەرم بوو، ساڵو نیوێك لە مەسیف پێکەوە لە باغچەیەك وێگڕا کارمان دەکردو نێوانمان زۆر خۆشبوو. نانو چامان خواردو بەرەو سەری ڕەش وەسەرکەوتین. دوور بە دوور دەنگیان داین، پێمان گوتن بڵێن سەعید کوێستانیە دێتە سەر. شاکر بەگ پیاوێکی بە خۆوەی ڕووسیە دیتوو بوو، بەرەو پیرم هاتو لەباوەشی گرتم و زۆری رێز لێگرتین. دانیشتبووین باسی هەولێرمان بۆ دەگێڕاوە، کە بارزانییەك هاتو نامەیەکی دا بە شاکر بەگ. دوای خوێندنەوە، دای بەمنو گوتی وابزانم نامەی هەڤالی ئێوەیە، ئی ئەحمەد تۆفیق. دیار بوو شاکر بەگ کاك ئەحمەدی دەناسی. کە نامەکەم

خوێندەوە، پێکەنیمو گوتم کاك شاکر ئەو نامەیەش ئی هەڤاڵی منە، واتە ئەوەی دەیەوێ بێتە سەرێ و نامەکەی هێناوە ناوی کاك فایقەو هاوڕێی منە، دێتە لاتان تکایە هاوکاری بکەن، نووسیویە دوو تفەنگی برنومان پێویستە دەیان کڕین. شاکر بەگ پێکەنی و گوتی بلا با بێنە سەر.

کاتێك کاك فایق هات کوڕێکی دەگەڵ بوو بە نێوی مامەند، من نەمدەناسی، نیوی ئەسڵی قادری قازی بوو، دوایی بووینە ڕەفیق. کاك قادر دوای شۆڕشی ئێران لە هێرشی پاسدارانی میاندواو بۆ سەر چۆمی مەجیدخان شەهیدبوو، یادی بە خێرو ڕوحی شاد بێ.

بەیانی دوای مالاوایی لە شاکر بەگو پێشمەرگەکان، لەسەری ڕەش هاتینە خوار بۆسەر ڕێگای کۆیە، سواری ماشێنێکی باری بووینو هاتێنە کۆیە.

وەستا هەمزەو وەستا خدر دران بە بنکەی بێتواتێ کە بچن لەوێ بۆ پێشمەرگە جلو بەرگ بدروون.

لە کاروانچیان ئێستریکیشیان بۆ من گرت کە بچمە زینوێ شێخی منداڵەکان دامەزرێنمو بۆ پێوەندی گرتن لەگەڵ لاجانو شنۆو سندوسو... دەست بەکار بم.

ڕەگەڵ کاروانچی کەوتینە ڕێ بەرەو باڵەکایەتی. لە هەیبە سوڵتان وەسەر کەوتین، لەوێڕا باران دەستی پێکردو پێماندا باری. بیرەوەریەکی ناخۆشی کە هەتا ماوم لەبیرم ناچێ ئەو سەفەرە بوو. دیارە ئەو سەفەرە هەم زۆر خۆش بوو کە بێجگە لەپێشمەرگە، نە پۆلیسو نە شوڕتەی دەوڵەتی نەدەدیترا، هەم زۆریش ناخۆش بوو لەبەرئەو بارانە جێگای ئیشکمان نەمابوو. زارا سواربوو شێواوی لە پێش خۆی دانابوو، پەتوێکیان بەسەرەوە بوو، بەلام هیچ فایدەی نەبوو. ئێستا کە من خەریکم ئەو چەند دێڕە دەنووسم، چل و حەوت ساڵ لەو سەفەرە

ڕادەبرێو دەیان جارلە گەڵ زارا دادەنیشتینو باسی ئەو سەفەرە ناخۆشەمان دەکردەوەو لەبیرمان نەدەچۆوە.
شەوێ گەیشتینە شوێنێك پێیان دەگوت دۆڵی شاورێ لە نیزیکی گوندی پڵینگان. کاروانچیەکان باریان خستن. لەو دۆڵەدا شێواو و زارا لەسەر خیزێکی تەڕ ڕاکشان و پەتووە تەڕەکەیان زوو زوو دەکوشی و بە خۆیاندا دەداوە، ئاوری بەدارانمان کردبۆوە تینی بۆیان دەهاتو هەڵمیان لێهەڵدەستا. منیش بە چاو لێکەری لەکەردارەکان زوو زوو دەچووم داری گەورە گەورەم دێناو پێوەم دەنا، دەمکرد بەگڕە مشقەڵ!
زارا لە خەمی منو شێواو خەوی لێنەدەکەوت. تاوێ ناتاوێ بەمنی دەگوت تۆ وەرە تاوێك درێژ بە من دار دێنم. دەمکوت نانا زارا گیان تۆ لەگەڵ کچەکە بنوو ئێستا ڕۆژ دەبێتەوە دەڕۆین.
تەك چەندە خاترەو بیرەوەریەکی ناخۆشە! نێوان شەوو ڕۆژ کاروانچیەکان باریانلێناوەو وەڕێکەوتین، تا گەیشتینە گەلاڵەی باڵەکایەتی، لە باران پێدا بارین بێبەش نەبووین.
لای نیوەڕۆ گەیشتینە شارۆچکەی گەلاڵێ. ماشێنو شت نەبوو، دیسان ئێستریکمان گرتو زاراو شێواو سوار بوون بۆ ئێوارێ گەیشتینە زێنوێ شێخی. کاك فایق ناونیشانی ماڵی کاك خدر ڕەسووڵی دابووینێ چووین و لەو ماڵە ئاوەدانە خستمان. بەهۆی حورمەتی زۆری ئەو ماڵە بەڕێزە وەك لیباس وشککردنەوەو دانان لە جێگاو بانی وشك و، نانو چا ساز کردنو خواردنی خۆش، ماندوبوونمان لەبیرچۆوە. خوشکە ئەستی خێزانی کاك خدر، کە ئێستا حاجی خدرە، ئەوەندەمان بە دەورو بەر داهاتبوو شەرممان دەکرد. بۆ بەیانی کاك خدر خانوێکی بۆپەیدا کردین، بە پەتوێكو سەرینێكو لێفێك و حەسیرێك، خانووە چۆڵمان ئاوەدان کردەوە. زارا چوار دیوارێکی هەبایە ژوورەکەی ئەوەندە

...................................................................
خاوێن ڕادەگرت، نومای خۆشترین ماڵی پێدەبەخشی. ئێستاش ئەو  ماڵە بەر چاوەی بەجێی هێشتووە شاهیدی زیندووی دەورانەکانە.
نەخشی بەرچاوی زارا ڕووخۆشی و دلۆڤانی هەموو کاتی ئەو بۆ میوانو جیرانان، هەروەها بەهێند گرتنو ڕوو خۆشی و  دەم بەپێکەنین لەئاستی خەڵكو عاشقو ئەویندارى ماڵو مێرد بوو. لەهەمووی ئەوانە گرینگتر تا بڵێی ژنێکی کوردو کوردپەروەر بوو، زانیبای کەسێك نیشتمان پەروەرە، لە منی پتر خۆش دەویست، کوتبایان کەسێك دۆست بەکورد نییە، یان لەژاندارم و بەکرێگیراو نیزیکە ، کاتێك هاتبایە ماڵمان پێی دەکوتو بەچاویدا دەداوە، زۆر جار دەمکوت زارا لە ماڵی خۆمان کابرا مەشکێنەوە. دەیکوت نانا سەعید گیان، با خۆی بناسیّو جارێکی دی نەیەتەوە ماڵە ئێمە.
خانوەکەمان تەندوری تێدا نەبوو کە هەوڵێك بدەم برە گەنمێك پەیدا بکەم بیکەینە ئاردو نانی پێبکەین. گاوانی گوندمان دیتەوە قسەمان لەگەڵ کرد ئەو نانە زیادیەی ڕۆژانە کۆی دەکاتەوە بە ئێمەی بفرۆشێت. ڕۆژی وابوو تاریك دەبوو بە کاوەخۆ نانەکەی بۆ دێنایین. کاتێك کاك خدر هۆی نان نەکردنی بۆ ڕوون بۆوە کە زارا پێی عەیبە داوا بکا لەماڵی خەڵك نان بکا، وێڕای پێکەنین پێی ناخۆش بوو کە بۆچی تائێستا پێمان نەکوتوون ئیزنمان بدەن نان لەمالی ئەوان بکەین. زارا بەوحاڵەش نەچوو لەماڵان نان بکات، پیرێژنێکی جیرانی خۆمانی دۆزیەوە کە حەوتووی جارێك بە حەق دەست لە ماڵی خۆیان نانی بۆ دەکردین.

## سەردانی ناوچە

بە پێی دابەشکردنی کاری حیزبی کە لەکۆیە کردمان دەبوایە سەردانی چەند ناوچەیەکی ڕۆژهەڵات بکەم. لەبیرمە ئێوارێ کە باسم کرد سەبەینێ دەچمەوە ناوچەی نەغەدە، ئەو شەوە ئاگام لێبوو زارا هەرتاوێ ناتاوێ هەڵدەستاو دەنووستەوە. دووجار هەستام لێمپرسی بۆ نانووی؟ دەیکوت خەوم ڕەویوە! دەمزانی نیگەرانەو بەو سەفەرە وەڕەزە. ناچار ئەو ڕۆژە بۆ بەیانی سەفەرەکەم نەکرد. دووسێ جار لەگەڵی دانیشتم، لێم دەپرسی بۆ بە چوونەوەی من ناڕەحەتی، پێم بڵێ با بزانم. زارا فرمێسکی دەهاتە خوارو دەیکوت تۆ ئاگات لێنییە هەموو ڕۆژێ لەسەر ئەو سنوورانە خەڵك دەکوژرێ، من نیگەرانی ئەوەم تۆ بەتاقی تەنیا لەگەڵ کابرایەکی قاچاغچی دەچیەوە ئێران، جاشوجاسووس وەك چاوێشەدار دەسووڕێنەوە، کوا پیاو سەری ساغ دێنێتەوە. بەڵێنم پێدا تاکەسێکی ناسیاوی جێگای موتمانە نەبینمەوە نەڕۆمەوە. ڕۆژێك دیتم مەلا قادری لاچینی پەیدابوو. پێشنیارم پێکرد باسەرێکی ناوچەی نەغەدە بدەین، زۆری پێخۆشبوو. زارا بە مەلا قادری گوت سەعید چوارپێنج ساڵە لەئێران دوورەو نەچۆتەوە، لەو ماوەدا زۆرشت گۆڕاوە، دەبێ زۆر وریای سەعید بی. پاشان بەپێکەنینەوە پێیگوت کوڕە مەلا قادر، سەعید شتێکی بەسەر بێ بە دەستی خۆم دەتکوژم. مەلا قادر هێشتا قاچاغ نەببوو، کوتی براژن، لەپێشدا ئەو شوێنەی دەچین بەتاقیی دەکەمەوە دوایە بۆشەوێ بۆی دەچین. دەکرێ بڵێم تا ڕادەیەك زارا ئاسوودە خاتر بوو و لە نیگەرانی هاتەدەر.

من بێخەبەر بووم کە کاك ئەحمەد تۆفیق چەند نامەیەکی داوە بە مەلا قادر هەتا لە مەهاباد بیدا بەوکەسانەی پێوەندی لەگەڵیان هەیە. دوو سەعاتێکی ڕۆژ مابوو وەڕێکەوتین. بۆ

هەوەڵین جار دیتم زارا قاپێکی ئاو لەدوای ڕشتین، ئیتر لەو کاتەوە بۆ هەر جێگایەك دەچووم قاپێکی ئاو لەدوای دەڕشتم، گۆیا ئاو ڕووناکاییەو بەسەلامەتی دەگەڕێمەوە، تەنانەت کە لەو ساڵانەی دواییدا هاتبووینە سوئێدیش، سەفەرم کردبایەو لەگەڵ کوڕو زاواکان چووباینە شارێك، قاپە ئاوی خۆی هەر دەڕشت. پێم دەگوت زارا لە سوئێد خۆ ڕێگاگرتن‌و مەترسیەك نییە، توخوا ئەو ئاوەی دەویٚ؟ زاراش بەزەردەخەنەوە دەیگوت بڕۆ بەخێر چی!

لەگەڵ مەلا قادر بەرەو سنوور هەڵگەڕاین، تۆزێك تاریك بوو، داگەڕاینە خواریٚ و کەوتینە دەشتی لاجانیٚ. پاش پێنج شەش کاتژمێر کە بە توندی ڕێگامان دەبڕی گەیشتینە گوندی بایزاویٚ ماڵی مەلا سادقی زەندی. کۆنە ڕەفیق بووین، بەو دیدارە زۆر شاد بووین. بەیانی مەلا قادر گوتی من ئێستا دەڕۆم بەرەو مەهابادو تۆش لێرەڕا بەرۆژ دەڕۆی بەشەو دەڕۆی کەیفی خۆتە. هەرچی گوتم قەرارمان وا نەبووە، لانیکەم تا گوندی ئاڵیاویٚ یان قارنیٚ لەگەڵم وەرە بچوە نێو دیٚ، ئاشنایەکی خۆم بۆ بانگ بکە، دوایی تۆ بۆکویٚ دەڕۆی بڕۆ، نەخێر مەلا قادر لاقی لیٚ لەکەوشی کردم و کوتی من نامەی کاك ئەحمەدم پێیەو دەچمە مەهاباد، نایەمە سندوس دوور دەکەومەوە. بەئاشکرا کردن‌و پێبوونی نامەی ئەحمەد تۆفیق، ئەو جار هەرپێم خۆش نەبوو لەگەڵم بێت. من بۆیەم پیٚخۆشبوو وێگرا بین ئەو قاچاغ نەبوو، بەڵام کاتێك نامەی پێیە ئیتر قاچاغەو بەکاری من نایە.

ڕاوەستام تائێواریٚ بەرەو ئاڵیاویٚ ڕۆیشتم، شەویٚ چووم لە دەرگای ماڵێکم دا پێم وابوو ماڵی خوشکمە، ژنێك هاتەدەر لێم پرسی ماڵی فلانکەس کامەیە؟ ژنە لەگەڵم هات ماڵی خوشکمی پیٚ نیشاندام. عەبدوڵڵا دووکلاو زاوام بوو، خوشکم و عەبدوڵڵا چاویان تی بڕیبووم ڕاوەستابوون دەتکوت ئیشك هەڵاتوون. من

پێکەنیمو گوتم هەیها نەتان خۆم سەعیدم نامناسن؟! غاریان دا باوەشیان پێداکردم دەستیان کرد بەماچو مووچو پێکەنینو گریانی شادی. باوەڕیان نەدەکرد پاش چوار پێنج ساڵ ئاوا لەپڕ ڕا پەیدا بم.

## دەستکردن بەکاری ڕێکخستن

دوای چاكو چۆنیو نان و چا خواردن، بە خوشکم گوت بمبە ماڵی کاك ڕەحمانی هەمزە، چوونکە ئەو ژنەی ئێرەی پێشانداوم، دیتوومی، با شوێنە ونکەیەك بکەم. عەبدوڵڵای زاوامان چوو ڕەحمانی هەستاندو هێنای شەوێ چووم لەوێ نووستم. تالای نیوەڕۆ خەوتم و هەڵنەستام. کاك ڕەحمان بێجگە لەوەی ڕەفیقی دەورانی لاویەتیم بوو، هاوڕێیەکی حیزبێش بوو، دەیان بیرەوەریو کۆبوونەوەو شەونشینیو سەفەرمان وێگڕا کردبوو.

بۆئەوەی نەچمەوە نێو باسو خواسی سیاسی هەر ئەوەندە دەڵێم، ئیتر لەوێڕا بۆ هەر جێگایەك دەچووم، هەر شەوەی کەسێکم هەڵدەگرتو لەو دێیە بۆو دێیە کۆبوونەوەم پێك دێناو کۆمێتەو شانەکانی حیزبیم تازە دەکردنەوە. بارو دۆخی هەوای سیاسی زۆر خۆشبوو، شۆرش لە باشوور دەستی پێ کردبوو، خەڵك بەتەواوی ئامادەی کارو تێکۆشان بوون. دەکرێ بڵێم بە ماوەی دە دوازدە ڕۆژان تاڕادەیەك لە نەغەدەو سندوس هەتادەگاتە شنۆ، پێوەندیەکی زنجیرەییم پێكهێناو ئاخر شەو لە گوندی بابخالاوێ لەماڵی محمدی عەبدوڵڵای عومەران کە خزمێکی خۆم بوو دیدارم لەگەڵ تازە کردەوە. بۆ بەیانیش زۆر زوو پێکەوە بەرەو شارۆچکەی زینوێ شێخی واتە باشوور وەڕێکەوتین. کاك محمد یەکێك

لەو مرۆڤە بڕواپێکراوانە بوو کە دەبوایە سەری پێ بسپێردرێ. هەرچەند دەست کورت بوو، بەڵام پیاوی ئاوا دڵ و دەروون ئاواڵەو نان خۆش‌و ماڵ بەمیوان کەم بوون.

ناو براو زۆری ئەرك بەسەر منەوە بوو. لە ساڵانی دوایی و پاش شۆڕشی ئێران کە شۆڕشی کوردستانی ئێرانیش لە جەنگەی خۆی دابوو و ئێمەش لە شآخ و کێو بووین، ڕۆژێك لە گوندی کارێزەی ناوچەی ماوەت لێم وەژوور کەوت. پێم سەیر بوو، شادم نەهاتە پێش چاوان. پاش نان خواردن بۆی باسکردم کە کورێکی گیراوە ئەگەر فریای نەکەوێت ئێعدام دەکرێ. لە وتەکانی دەرکەوت کوڕەکەی کادری حیزب بووەو گیراوە. پێم گوت کاکە گیان ئەگەر پێتوایە ئەمن شتێکم لەدەست دێ بێ شك دریغ ناکەم. گوتی کاری من بە پووڵ جێبەجێ دەبێ و دەزانم تۆش پووڵت نییە. بەڵام ڕێنوێنیان کردوم بچمە لای دوکتور قاسملوو مەسەلەی کوڕەکەمی بۆبگێڕمەوە بەڵکوو یاریدەم بدات. بۆ چوونە لای ناوبراو بە پرسیارکردن هاتم تۆم دیتەوە کە من بگەیەنیە لای دوکتور.

دیارە من ئەو کارەم بۆکردو دوکتوریش قەولی پێدا. دوای چوار ڕۆژ مانەوەی لە دۆڵی دێموکڕات هاتەوە کارێزەو منیش تا سەر چۆمی هەرزنەم برد هەتا لە وێڕا قاچاغچی بیگەیەنێتە سەردەشت.

دوکتور دوسەت هەزار تمەنێکی دابوویە، دەیکوت پیاوێك بەڵێنی پێداوم بە دووسەت هەزار کوڕەکەم لە مردن ڕزگار بکا.

ئیتر دوایی من لێی بێهەواڵ بووم‌و هاتمە دەرەوەو نەمزانی کوڕەکەی چی بەسەر هات. وەک بیستوومە ناوبراو نەماوە. زۆری زەحمەت کێشاوەو شەونەخوونی بۆ کورد زۆر

چێشتووه. لەخوا داواکارم جێگای بەهەشتی بەرین بێ. نێوان بابخالاویێو زینویێی شێخی لە دە کاتژمێر پترە. دوای ئەوەی گەیشتینەوە زینوێ حەساینەوەو...

پاش یەك دوو ڕۆژان ڕاپورتی سەفەرەکەی خۆم نووسییو ناردم. ئیتر دوایی زۆر بەکەمی سەفەرم دەکرد. لەناوچەی شنۆ و سندوس ولاجان پەیکم دیاری کردبوو، ناو نیشان، واتە (عەلامەتی تەماس) داندرابوو. هەرکاتێ بەهەر کەسێکت گوتبایە بە فلانکەس بلێ، مەسەلەن بۆنموونە؛ فلان حاجی دوکاندار داوای قەرزەکەی دەکا، دەسبەجێ کۆمیتەکە یەکێکی دەنارد دەگەیشتێو کارەکەم ڕادەپەڕاند. بەڕواڵەت لەگەڵ مەلا محمدی خزری خەریکی قەسابی بووین، بەلام هەرکاتێ کارێکی سیاسیمان بۆ هاتبایە پێش ڕاماندەپەڕاند.

لەو دەوراندا ژیان تابلێی سەختو دژوار بوو. کەسێکمان لە پشت نەبوو لەباری ماددیەوە یارمەتییەکمان پێ بکات. دەبوایە هەم ژیانی خۆمان دابین بکەین هەم نەیەڵین کاروباری تەشکیلاتی دواکەوێت. لەشانەو کۆمیتەکانیش ئەو یارمەتییەی کۆ دەکراوە هەر لە ناوچە دەبوایە بیدەن بەکەلوپەلی پێویستی وەکوو نەفتو شەکرو کەوشو پارچە بۆجلی پێشمەرگەو... بەنهێنی بیگەیەننە ئەو دیوو لە تا بنکەکانی شۆرش دابەش بکرێ. چوونکە زیاتر لە دووساڵ ژیانی پێشمەرگەی شۆرش لەو پەڕی خراپی دابوو، دەبوایە یارمەتی بدرێن. ئیتر دوایی وردە وردە بە هۆی یارمەتیدانی ئێرانو... ژیانی شۆرشگێڕان باش بوو، حەوجێ بە ئێمەو مانان نەما. دوایی ئەوان جارو بار تەنانەت تفەنگ و فیشەكو کەلوپەلی پێشمەرگەشیان دەداینێ.

رژێمی شای ئێران ورده ورده له نێو شۆرشدا نفووزی کرد، به تایبەتی له شارۆچکەی زینوێی شێخی بە هۆی مستەفای کوڕی شێخ عوبەیدیلا دەکرێ بڵێین ئەو شارۆچکەیە بوو بە بنکەی جاسووسی ساواكو دزو جەردە. ئێمە کە ماڵمان لەوێ بوو، کۆنترۆڵ زۆر زەحمەت ببوو. هێندەش ئەو ترس و لەرزە نەدەکرا، ناچار ماڵەکەمان بردە گوندی خەلان. تاڕادەیەك ئەوێ لە زینوێ باشتر بوو. لەوێ میوانیشمان کەمتر دەهات. چونکە خەڵك پێی وابوو ماڵی کادرەکانی حیزب بنکەیە بۆ میوان! لە کوردەواریشدا زۆر جار میوان دێتو ڕەسمیشە دەبێ بەخێرهاتن بکرێو سەرو ڕووت لەگەڵی خۆشبێ، چونکە ئەوەی دێتەماڵت دۆست و ئاشناو ناسیاوە. دوای نان خواردنیش زۆربەیان دەڵێن لەحیزب بەزیادبێ! ئێتر کەم کەس دەزانێ ئەگەر کادرێك مانگانەش وەربگرێ بەحاڵەحاڵ بەشی ژیانەکەی دەکا. زارای هاوسەریشم بێجگەلەوەی کە لەگەڵ هەموو کەس سەرو ڕوخۆش بوو، زۆر جاری وابوو بەهۆی ناسیاریو بەزەیی پێداهاتن، جلەکانیشی بۆ دەشووتن! زۆر جار من لەو بارەوە بۆڵەم دەکردو دەمگوت زارا خۆتۆ جل شۆر نی بێبەلابی. لەوەلامدا دەیگوت دەوڵەمەند قوربانیو خێرو خێرات دەکا، ئێمەش دەستو لەشی ساغمان هەیە، سندوقی سەری منداڵەکان بێ. تۆخوا سەعید ئەو ڕێگەیەم لێ مەگرە.

ڕۆژێك لە گەلاڵێ دەهاتمەوە لە نێوان ئازادیو خەلان تووشی کاك عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ و دوکتور حەسەنی حیسامی بووم. ورده ورده بە قەدەم لێدانو قسەکردن بەرەو خەلان هاتین گەیشتینە نێو دێ و ماڵی منیش لە پێشەوە بوو، خولقم کردن. ئەوانیش قبووڵیان کرد. زارای خێزان

بەگەرمی بەخێرهاتنی کردن. هەر دووکمان هەوەڵین جاربوو ئەو دوو میوانانەمان دەدیتن، نەمان دەناسین.
زارا پرسی سەعید ئەوانە کێن، خۆ لەماست بەولاوە هیچمان نییەو نیوەڕۆیە چبکەین؟ گوتم دەچمە نێودێ هێلکە پەیدا دەکەم. پێنج شەش ماڵ چووم تا پێنج هێلکەم کڕی. کردی بەهێلکەو ڕۆنو ماستیشمان هەبوو، دامانناو. پێیان جەمێکی باشو شاهانە بوو، چوونکە جگە لەوەی خەڵك فەقیر بوو هیچیش دەست نەدەکەوت. زارا پرسی ئەوانە کێ بوون کە ئاوا بەدەوروبەریاندا دەهاتی؟ لەوەڵامدا پێمگوت هەردووکیان میوانی مەلا مستەفا بارزانین. کاك عیزەدین مستەفا لەدەرەوە ڕا هاتووتەوە، دوکتوریش لەسۆڤیەت ڕا هاتۆتەوە ئێران و ئێستا هەڵاتووەو قەرارە مەلا مستەفا بینێرێتەوە دەرەوە. بۆیە بەدەوریاندا دێم بەڵکوو لەدەرەوە کارێك بۆ کورد بکەن.
لە خەلان سەرمان داخستبوو حەوتووی جارێك لە گەڵ مەلا محەمەد گیسکێکمان دەکڕی دەمان کوشتەوە پێج شەش کیلۆی دەبوو، کیلۆ کیلۆمان دەکرد دەمانبردە زینوێ، ئەو دوکاندارانەی دۆستمان بوون هەر کەس کیلۆیەکی دەکڕی. ئەوانیش تەنیا بۆیە دەیانکڕی کە ئێمە لەدەستماندا نەمێنێتەوە.
خەڵك دەستڕۆیو نەبوو زۆر بەکەمی گۆشتیان دەخوارد. بۆخۆشمان زاراو خوشکە تووبای هاوسەری مەلا محمد سەروپێو ورگەکەیان چاك دەکردو لە گەڵ ئەو جەرگو دڵو سیپەلکەی نەدەفرۆشا، تامەزرۆی خۆمان پێدەشکاند.
ژیانمان ناخۆشبوو، بەڵام چونکی لەپێناو خەبات بۆ گەلو نیشتمان بوو، دەمانزانی ئەوە چارەنووسی کەسانی نیشتمان پەروەرەو تەنیا سەر بەرزی دەتوانێ سەرمایەی

دوا ڕۆژی مرۆڤ بێ، بەوە خۆمان قانع دەکرد. براژنە تووباو زاراش تێکەڵی ئەو بیرو ڕایە ببوون و لەگەڵمان هاوبیر بوون. هەر بۆیەش بوو کاتێ ئێمە خەمو پەرۆشیو نارەحەتیمان بۆ دەهاتە پێش، تەنیا خوشکە تووباو زارای هاوسەرم بوون دڵخۆشیان دەداینەوەو لەگەڵ ئێمە ببوونە مامەخەمەو پشتو پەنامانو لەڕۆژانی سەخت و تەنگانەدا نەیاندەهێشت برسیەتیو هەژاریمان پێوە دیار بێ.

دەگەڕێمەوە بۆ ئەو کاتەی کە زارای هاوسەرم لە کوردستانی ئێران بەجێ مابوو بە دوامدا نارد کە بێتە لام. کاتێك هات دەستێکی لیباس پێبوو، دەبوایە لانیکەم دەستێکی دی بۆبکڕم، بەڵام نەمبوو. هەرگیز لەبیرم ناچێ کاتێك زارا لە کوردستانی ئێران مابۆوە، لەبەر من ماڵی بابی بۆجاری دووهەم بەجێ هێشت بەهیوای ئەوەی ئارەزویەکی کەهەیبێت لە هەولێر لەلای من دێتە دی، بەڵام من تەنانەت نەمتوانی دەستە لیباسێکی تازەی بۆبکڕم. دیارە پووڵم نەبوو، بەڵام پارتی لێژنەیەکی بۆ پەنابەران پێك هێنا بوو یارمەتییەکی باشی بەو نێوە کۆکردبۆوە. واتە پەنجا هەزار دیناریان بەنێوی ئێمە کۆکردبۆوە. دیارە ئەو پارەیە لەلای خۆیان بوو جارو بار کەلو پەلی وەك خواردەمەنیان بۆ دەکڕین. زۆرجار بەئێمەیان دەگوت ئەگەر پێویستییەکتان هەبوو پێمان بڵێن پووڵێکی زۆرمان بە نێوی ئێوە لەخەڵك وەرگرتووە. ئەو کات پەنجا هەزار دینار زۆربوو، مامۆستایەك هەشت دیناری موچەبوو. مەبەستم ئەوەیە، دەکرا من داوای یارمەتی بکەم و پارەیان لێوەربگرم و دەستێك جل بۆ زارا بکرم. چونکە خۆیان دووسێ جاریان پێڕاگەیاندبووم کە هەرکاتێك پێویستم بەیارمەتی بوو داوابکەم. کاتێك ئەوەم

بۆ زارا گێڕاوە لە وەڵامی پێشنیاری مندا گووتی من هیچ کاتێك پێم خۆش نییە تۆ بچی خۆت بشکێنی و خۆت بێنیە خوار داوای یارمەتی بکەی کە داخوا ئەوە چییە من لیباسی جوان لە بەربکەم، نابێ کاری وابکەی. ئەگەر بێت و کارێکی وا بکەی من لە بەریان ناکەم.

زارا ڕەتکردنەوەی پێشنیارەکەی منی ئەوەندە بە جیددی بوو، وازم لە داخواز و پێشنیارەکەی خۆم هێنا. بەڕاستی بەرزە نەفسی زارا لەهەموو کاتو ساتێکدا کە دەمویست کارێکی ئاوابکەم و مەشوەڕەتم لەگەڵ دەکرد، منی وەخۆ دێناوە. زۆر جاران قسەو پێشنیارەکانی زارا منی هاندەدا نزم نەفس نەبم. هاوڕێو دۆست و ئاشناکانم لە باری بەرز نەفسی بنەماڵەیەوە ئێمە دەناسن.

دەتوانم بەڕاشکاوی بڵێم دەستکەوتی بەرز نەفسی بنەماڵەیی ئێمە دەگەڕێتەوە سەر دڵفرەوانی و بەرز نەفسی زارای هاوسەرم.

لە دەورو بەری ساڵی هەشتاو شەشدا خەریکی خۆ سازکردن بووین کوردستان بەجێ بێڵینو بێینە دەرەوە. لەو کاتەدا مامۆستا شێخ عیزەدین یارمەتیەکی دیاری کرد بوو، بە کاك سەید جەمیلی گوتبوو یارمەتیەکەمان بداتێ. کاتێك سەید جەمیل ویستی بمداتێ، من سوپاسم کردوو، یارمەتیەکەم وەرنەگرت. لە بیرمە هەم کاك سەید جەمیل، هەم کاك سەید حەسەنی هاشمی کە میوانی ناوبراو بوون، زۆریان هەوڵدا وەری بگرم، وەرم نەگرت. کە چوومەوە ماڵێ ئەوەم بۆ زارا گێڕاوە، بەزەردە خەنەوە گوتی ئاخر تۆ ئەو پیاوەی بۆیە شانازیت پێوە دەکەم. بەڕاستی هەرگیز ئەو قسە خۆشە پڕ لە دلۆڤانیەی زارام لەبیر ناچێ.

بەڕاستی لەبارەی بەرزە نەفسی و خۆ نەشکاندن لە ئاستی پووڵو پارەو خۆڕاگری، هەرچەندی باسی زارا بکەم کەمە و پێشم وایە ئەگەر هەموو شتێك بگێڕمەوە دەبێتە تاریف کردن، هەر بۆیە پاشقولم داوەو لە زۆر شت خۆم پاراستووە.

## دیسان شۆڕش

هەرکاتێك وتوو وێژی نێوان شۆرشو ڕژیم لەعێڕاق کۆتایی دەهات، بۆمبارانیشی بەدواوە بوو. لە ساڵدا نیزیك بە هەشت مانگ ئێمە دەبوایە نێوانی شەوو ڕۆژ واتە پارشێوێ هەستین بڕۆین بۆ شاخو لە جێگای بەردەلانو قایم خۆمان بشارینەوە، تاشەو دادەهات لەوێ باین و درەنگانێك هاتباینەوە نان و کاروباری ماڵمان کردبایەو دیسان پارشێوێ هەستاباین ڕوومان لە چیا کردبایەوە. کاتێك پایز دادەهات ئاسوودەتر بووین، ڕۆژانێك کە هەورو بارانی دەبوو جێژنەمان بوو کە تەیارە نایەو بۆمباران ناکرێین!
ڕۆژێك هاوار هەستا کە لە نیزیکی ئاشی شێخی دە دوازدە کەس کوژراون. ئێمە ئاگادار بووین کە فرۆکەیەکی میگ بۆمبایەکی لە نێو دارەکانی ئاشی شێخیدا، بەلام نەماندەزانی ئەوێ خەڵکی لێیە، شەوێ هێندێك ماڵە دۆم هاتبوون لەو نێو دارانە چادریان هەڵدابوو، بە چیك و چاڵ دایان پۆشیبوو، تەیارە ڕەچاویان دەکاو ئەو کارەساتەی بەسەر هێنان. بێجگەلە کوژراو و بریندارییشیان زۆربوو، بەلام کەس نەیزانی شەوێ بۆکوێ ڕاگوێزرابوون وچیان بەسەر هات. زیاتر لە مانگێکی پێ چووبوو ئەو نێودارانە بۆگەنیوی لێدەهات، لەبەر ئەوەی ئەو بۆمە بێجگە لە کوشتنی مرۆڤەکان، سەگ و تاژی و مریشك و کەڵەبابی ئەو

ماڵە دۆمانەشی قڕ کردبوو. رژێمی بەعسی فڕۆکەوانەکانی ئەوەندە بێ بەزە بار هێنابوو هەرچی جووڵاباوە لێیان دەدا.

لە ترسی بۆمباران ئێمە گوندمان بەجێ هێشتبوو لەسەرەوەی گوندی خەلانێ لە نێو گڕە بەردەکاندا بووین، دوو فڕۆکەی میگ هاتن سووڕێکیان داو بۆمبێکیان لە نێو گارانی گوندی خەلانو ئالانێ دا. لەپێش چاومان دیار بوو کە بەدەیان سەری مانگاو جوانەگاو گوێلك لەنێو تەپوتۆزدا تێکەوە گلاند. ئەو هەموو خەڵکە لەوێ بووین هیچ کەس زاتی نەکرد بچێ سەریان ببڕێو نەهێڵن مندار ببنەوە. ئێوارێ کە ترسی فڕۆکەو بۆمباران نەما، جگە لەچەند سەرێك ئەوانی تر مندار ببوونەوە. کوردیش بەپێی ئاینێکی هەیەتی ئەگەر بە بۆمباو گوللە شتێك بکوژرێ سێلاوی خوێنی لەبەر بڕوا، تا بۆخۆی بە چەقۆ سەری نەبڕێو خوێنی لەبەر نەڕوا نایخواو پێی حەرامە!!

دیسان لە شارۆچکەی زینوێ پیرە پیاوێك بەنێوی مام ئەحمەد خەڵکی گوندی سەلان باری کەرێکی ترێڕەشە هێنا بوو بۆ ئەوەی بە پووتە گەنمێکی بگۆڕێتەوە ژیانی مندالەکانی پێدابین بکا. لە بندیواری زینوێ فرۆکەیەك بۆمبایەکی پێدادا، بارە ترێ و مام ئەحمەدی لەگەڵ گڵو خۆڵ تێکەوە پێچاو شەهیدی کرد، تەنانەت گوێ درێژەکەشی کوشت. فڕۆکەوانە بێ بەزەو بێ ئینسافەکان بۆ بارەقەڵلای حەسەن بەکرو سەدام حوسێن دەستیان لە هیچ تاوان و جینایەتێك نەدەپاراست.

ئێمەش لەسەر ئەو بەدبەختیو نابەسامانییەڕا کەوتبووینە بەر ڕقو کینەی کاربەدەستانی شۆرش، بەتاوانی ئەوەی داوای کۆبوونەوە دەکەین بۆ پاراستنی

یەکێتی خۆمانو داهاتووی نادیاری نەتەوەیی‌و هەروەها چاوەڕوانی ئاکامی شۆرش‌و هێندێك مافی کورد لە باشوری کوردستان. کە لەو سەردەمدا ڕۆژانە دەیان مرۆڤ لە شاخو کێوو نێو ماڵی خۆیاندا دەبوونە دەستەچیلەی ئاگری شۆرش، ڕاست لەو کاتەدا بە ناردنی زەکی عەقراوی، دەیان کەسی وەك منی کادری ماندوو نەناس، بە برسێتی لەژێر بومبارانو کونە ئەشکەوتاندا، لە ژێر چاوەدێری پاراستن و ساواکدا بوون و تەنانەت ئەو ژیانە پڕلە ڕەزاڵەتەشیان پێ ڕەوا نەدەدیتین.

لە خۆم دەپرسی ئێمە دەبێ چبکەین، ئایا دەبێ لە ناچاریان جارێکی دیکە بۆ وڵاتێکی دیکە ئاوارەتر بین؟

تاماوم لە بیرم ناچێ منی بەژن و منداڵ سەرە ڕای ئەو ژیانە شڕەی ئاوارەیی، وێڕای خۆشاردنەوە لە بۆمباو فڕۆکەو ترسی گرتن‌و تەسلیمکردنەوە بە دوژمن، بە گوشاری خۆیی ناچار بکرێین جارێکی دیکەش ئاوارەی وڵاتێکی دیکە بین!

## بەرەو مەکتەبی سیاسی

بێ ئەوەی تاوانێکمان کردبێ، بەیانی زوو کە هەستاین لەچوار دەوری بنکەکەمان ڕەشاش دابەسترابوو، واتە بنکەی حیزب گیرابوو. ئێمە کێشەمان لە گەڵ کەس نەبوو، من چوومەدەرو بەسەرکردەی ئەو چەکدارانەی هێرشیان کردبووە سەرمان و دەورەیان دابووین گوتم فەرموو کاك زەکی، تەشریف بێنە ژوور چایەك بخۆوە، ئەگەر گیروگرفتێك هەیە چارەسەری بکەین.

زەکی هاتە ژوورو گوتی عەقید کافی ئێمەی ناردووە، بە تێکڕایی هەمووتان چەك کەین. هیچ دەلیلیشی نەبوو بۆچی دەبێ چەك

بکرێین؟! بەڵام ئێمە بۆخۆمان دەمان زانی ئەحمەد تۆفیق عەقید کافی هانداوە ئەو کارەمان لەگەڵ بکا.
چەکەکانمان تەسلیم کردو ڕۆیشتن. ئەو کردەوەی سەرکردەی شۆرش لەو سەر سنوورە، لە کوردستانی ڕۆژهەڵات وەك تۆپ دەنگی داوە. لەباری پرستیژەوە زەربەیەکی ئەوەندە قورس بوو قەرەبوو نەدەکراوە. دوای ئەو کردەوەی کاربەدەستانی شۆرش، ئێمەش ناچار بووین بڕیار بدەین ئەو شوێنە بەجێ بێڵین‌و ڕوو لە مەکتەبی سیاسی بکەین. بەداخەوە ئەوکاتیش نێوانی بارزانی و مەکتەبی سیاسی پارتی زۆر لێڵ‌و ناڕوون بوو، سەر ئەنجامیش هەموو لایەك ئاگادارن کە چ بەدبەختییەکی لێ پیك‌هات و ئەو هەڵەکاریانە چارەنووسی کوردی بە کوێ گەیاندو چەندین ساڵی مەسەلەی کوردو مافی کورد وەپاش داو، دیتمان ئەو شۆرشە گەورەیە چۆن تووشی نەهاتی‌و سەرلێشێواوی هەرکەس هەرکەسی‌و ئاش بەتاڵی هات.

## مشوور خواردن!

ڕۆژێکی تەنگ بوو، دەبوایە لەگەڵ زارای هاوسەرم دانیشم‌و مشوورێك بخۆین. قسەی من ئەوە بوو کە ئێمە پاش ئەو زەحمەت‌و کوێرەوەریەی لە نێو ئەو حیزبەدا دیتوومانە، تا ئێرە ئەوە ئاکامەکەیەتی کە دەیبینین، ڕەفیقەکان بەرەو قەڵادزێ ڕۆیشتن، پێتوایە من دەبێ چبکەم و ڕەئیت چییە زارا؟
کورتەی ڕوانگەی زارا ئەوە بوو گوتی؛ ئەگەر بڵێم دانیشە کاسپی بکە، لەلایەك واز هێنانم پێ باش نییە، لەلایەکی دیکەشەوە هەڵبڕان لە هاوڕێکانت جێگای نیگەرانییەو دەترسم دوژمن زەفەرت پێ بەرێ بتکوژن. کەوایە دەست لە هاوڕێکانت هەڵمەگرەو پێکەوە مەشوەڕەت بکەن بزانن چۆنتان پێ باشە

..................................................................

وابکەن. تۆش نیگەرانی ئێمە مەبەو هەرکاتێ لەشوێنێك دامەزرای بنێرە ئێمەش بەرە بۆ لای خۆت. برۆ لەوە زیاتر بیری لێ مەکەوە، ئەوە ژیانی سیاسی و دەربەدەریە.

لەسەر ئەوە ساخ بووینەوە منیش وێڕای هاورێکانم بچمە قەڵادزێو بزانین بارزانی چمان پێدەڵێ. هەمووکمان لەوێ کۆبووینەوە، پتر لە مانگێك لەوێ بووین. کە دیتمان هیچمان بۆ ناکرێ، بڕیارماندا بچینە مەکتەبی سیاسیو بزانین ئەوان یارمەتیمان دەدەن لەوی بمێنینەوەو دەست بەخەبات بکەین، یان ئەوانیش بڕیاری بیلاتەکلیفیمان لەسەر دەدەن!

لێرە ڕا بارە سیاسیەکەی بە جێ دێڵم چوونکە بە تەواوی لە بەرگی یەکی بیرەوەریەکانمدا باسم کردووە کە چەکیان داینێو ژیانیان دابین کردینو ئەو پەڕی یارمەتیان پێکردین. لەباری چۆنیەتی بنەماڵەییەوە دەست دەکەمەوە بەنووسینی جۆری ژیانو هێنانی ماڵو گیرسانەوە لە شینکایەتی.

لە گوندی شەشۆی پشتی شارۆچکەی ماوەت خانوێکم پەیدا کردو محمدی کاکاغازادە کە کادرێکی چالاکی حیزبی بوو، بە قاچاغی بەبێ وەرەقە ڕۆیشت بۆ زینوێی شێخیو زاراو شێواوی لەگەڵ ئەو شڕڕەو بڕڕەی هەمان بوو بە هەولێرو سلێمانیدا گەیاندە گوندی شەشۆ. واتە پاش ماوەیەك دووری ئەو جاریش لەگەڵ زارا یەکترمان گرتەوە. دوایی کۆمیتەی ساخکەرەوە لە کۆبوونەوەیەکدا تەقسیمی کاری خۆی کردو دەبوایە وێڕای هاورێیان بەرەو مەهابادو ناوچەکانیتر وەڕێکەوین. مام ساڵح کەیخودای گوندی شەشۆیەم تێگەیاند کە من بۆکاری حیزبی دەڕۆمو پیاوەتیم لەگەڵ بکە ئاگاداریەك لە منداڵەکانم بکە. ناوبراو زۆر مەردانە بەڵێنی دا ببێتە برا، هەر یارمەتیەکیان پێویست بوو بیکات. کە تۆزێك خاترجەم بووم، دوای حەوتووێك دێسان زاراو شێواوم بە تەنیا هێشتنەوەو لەگەڵ هاوڕێیان

شەهید هاشم ئەقەللطلاب، محمد کاکاغازادە، حەسەن نەغەدەیان و شەهید یۆنس ئاهنگەری، بەرەو مەهابادو ناوچەکان خودا حافیزیم لە زارا کردو ڕۆیشتم.

## کێشەو بەد بەختی دوای من!

پێشتر ئاماژەیەکم بە ناکۆکیو ناتەبایی نێوان بارزانی و مەکتەبی سیاسی پارتی کرد. ئەگەر بێت و هۆی ئەو ناکۆکیەی نێوانیان باس بکرێ بۆخۆی کتێبێکە. چونکە گرژیەکە دەکێشێتە سەر باری عەشیرەتیو خۆویستیو نەگونجانی سیاسی. ئەو بەشە مێژووییەی بە مێژونووسان بسپێردرێ باشترەو لێی دەگەڕێین.

حەوتوویێك دوای وەڕێکەوتنی ئێمە بەرەو ڕۆژهەڵات، لە باشترین کاتی وتو وێژدا لەگەڵ ڕژیمی بەعس، مەلا مستەفای بارزانی بە کۆ کردنەوەی لەشکرێکی زۆری عەشیرەتی، هێرش بۆ سەر مەکتەبی سیاسی پارتی دەست پێدەکاو لە کوردستانی عێڕاقیان وەدەر دەنێ. لەو نێوەدا کە کاری کاك ئەحمەد تۆفیق ڕەونەق پەیدا دەکا، لەگەڵ چەکدارەکانی دەکەونە پێووشوێنی کادرەکانی دژ بەخۆیو ماڵی ئێمە. هاوسەرم زارا کاتێك هەست بەمەترسیو ئامانجی ئەحمەد تۆفیق دەکا، دەچێتە لای مام ساڵحی کەیخوداو داوای لێدەکا یاریدەی بدا. مام ساڵح دەیانباتە مووچەی خۆیانو دەیانشارێتەوەو بە ئەحمەد تۆفیق و چەکدارەکانی دەڵێ لێرە نەماون و باریان کردووە.

زارا ئەحمەد تۆفیقی باش دەناسیو دەیزانی کە ناوبراو من و قادر شەریف بەهەڵسوڕێنەری ئەو پێکهاتە دەزانێو ئاوا سووك و هاسان دەستمان لێهەڵناگرێ. زارا بۆی گێڕامەوە کوتی ترسم هەبوو بۆ گرتنی تۆ، من بەبارمتە بگرێو لە شوێنێکم دانێ بۆ

................................................................

ئەوەی بتوانێ تۆ لەداو بخات. منیش هەم لەبەر تۆ و هەم لە باری حەیسیەتەوە بۆئەوەی زەربەمان وێنەکەوێت، داوام لە مام ساڵح کرد یاریدەمان بدا بمان پەڕێنێتەوە دیوی ئێران.
زارا هەواڵی وەرگرتبوو کە لەشکری پارتی لە بەری ئێران لە ناوچەی ئالان کۆبوونەتەوە.
بێچارە مام ساڵحیش ناوێرێ ڕاست بۆ ناوچەی ئالانیان بنێرێ ، بەکەسێکدا ڕەوانەی گوندی ئاڵوەتانیان دەکا. ئێتر بەدبەختی دوبارەی زارا لەوێڕا دەست پێدەکاتەوە. زارا ڕێنوێنی دەکرێ بپەڕێتەوە ناوچەی ئالانو بچێتە لای پێشمەرگەی شکاوی پارتی. زارا دەبێ لە چۆمی گەورەی کەلۆێ بپەڕێتەوەو پردیش نییە، دارێکیان بەسەر چۆمیدا ڕایەڵکردوە خەڵك پێیدا بپەڕێتەوە. من خۆم کاتی خۆی جارێك لەگەڵ مەلا ئاوارە بەوێدا هاتین، نەمدەوێرا پێیدا بپەڕمەوە. دوای ساڵێك کاتێك زارا بۆی گێڕامەوە کەبەچ ترسو لەرزێك شێواوی لەکۆڵی کردووەو پەڕاندوویەتەوە، مچوڕکم بە لەشیدا دەهات. ئێستاش کە دیمەنی ئەو پەڕینەوەیەو بێکەسی زارای هاوسەرم وەبیر دێتەوە، گریانم دێت. زۆر جاران کە بیر لەو کوردە داماوە دەکەمەوە، دەڵێم چەند لە گەڵ یەکتری خراپو بێ بەزەین!
زارا دەپەڕێتەوەو بە پرسیاران دەچێتە گوندی بێژوێ، ڕوو لە ماڵی مامەند ئاغای سالاری دەکات. بە گوتەی زارا پێیوابووە ئەوە ماڵە گەورەیەو یاریدەی دەدەن. کە دەچێت بۆیان باس دەکا، بێ ئەوەی بحەسێتەوە بۆ ئافەرینێکی ژاندارم زاراو شێواو بە کوڕێکی خۆیدا دەنێرێتە دولکانو تەسلیمی پاسگای ژاندەرمەی دەکەن.
کوردەکان لەو گوندە کە دەپرسنو چۆنیەتی زارایان بۆ دەردەکەوێو دەزانن مەلا ئاوارە لەو ناوەدایە، بەنهێنی بە ناوبراو ڕادەگەیەنن. ئاوارەش مام جەلال ئاگادار دەکاو ئەویش

ڕەئیس حەمەدەمین دەنێرێتە پاسگاو، بە نێوی ئەوەی کە ئەوە ژنی شەهیدێکە ئازادی دەکەنو دەیانهێننە ماڵی ماموٚستا برایم ئەحمەد.
دوا بەدوای ئەو بەزمو ڕەزمە، دەوڵەتی ئێران بە پارتی ڕادەگەیەنێ کە پێشمەرگە دەبێ چەك دانێو ببێتە پەنابەر، یان ئێران بەجێ بێڵن! پارتیش بڕیاری گەڕانەوە دەداو ئەوەی پیرو بێتوانایە لەگەڵ ماڵی پێشمەرگەکان کران بە پەنابەر.
زاراو شێواویش ڕەگەڵ ئەوان دەخەنو بەڕێیان دەکەن بوٚ شاری هەمەدان و دەبنە پەنابەری ئێران.
زارا کە نێوی خوٚی گوٚڕیبوو کردبوویە حەیات، بەو نێوەو ژنە شەهیدێك دەکرێتە پەنابەرو لە گەڵ ماڵێك بە نێوی نهێنی مارف ئاغاو منیرە خان لەحەوشێکدا دەبن. دوای دوو ساڵان مارف ئاغاو مونیرە خان دێنەوە سولەیمانی.

## داواکردن بوٚ گەڕانەوەی زارا

منو شەهید قادر شەریف لەدەورو بەری مەهاباد بووین کە هەواڵمان وەرگرت شەڕی براکوژی ساز بووە. کاتێك لەشکرکێشی بارزانیمان بوٚسەر پارتی بیست زانیمان پێشمەرگەی پارتیيان ڕاوناوەو لە ئێرانیان کردوون. ئێمە دەستمان لەکاری ڕێکخستن هەڵگرتو بڕیارماندا بگەڕێینەوە بوٚلای ماوەت. لانیکەم من دەبوو بزانم منداڵەکانم چیان بەسەر هاتووە.
بە ماوەی سێ شەو گەیشتینەوە دەوروبەری ئاڵوەتان.
لای ماڵێك کە هاتبوونە سەر مووچەکەیان لاماندا و هەواڵی هاتنو چوٚنیەتی پێشمەرگەی پارتیمان لێپرسین. کابرا دەستی ڕاداشت بوٚلای بستووی پێشمانو گوتی هوٚو کەرو بارەی کە دەڕوا، ئەوە ئاخر کاروانو باریانە و ئەوڕوٚکە لە بەیانیەوە خەریکی

بارەبارن دەڕۆنەوە ئەو دیو. ئێمە هێشتا نەماندەزانی لەگەڵ مەلا مستەفا ڕێك کەوتوون، دەگەڕێنەوە یان تەسلیم بوونە. ئێمە خۆشحاڵ بووین بە گەڕانەوەیانو پێمان وابوو کێشەی نێوانیان کۆتایی پێهاتووە. بەڵام دوایی خەڵکی ترمان دیتو هەر ئەو ڕۆژە بۆیان ڕوون کردینەوە کە ئێران ڕەسەریداون ئەو وڵاتە بەجێ بێڵنو پارتی ناچار کراوە بگەڕێتەوە. ئێمەش هەستاین وەدوای ئەو کاروانە کەوتینو ئاوای ئەو دیو بووین. دەرکەوت کە چوونەتە چیای سوورکێو. ئێمەش ناچار بووین هەڵکشێین بۆ سوورکێو. چووینە لای مام جەلال، لە نووکەوە هەموو شتێکی بۆ باس کردین. پاش گێڕاینەوەی نەقڵو نەزیرەی ئێرانو دەرکردنیان لەئالان و... هەروەها چۆنیەتی هەڵاتنی زارای هاوسەرمو شێواوی کچمو گیرانیانو ئازاد کردنیانو دوایی ناردنیان لەگەڵ ماڵە پێشمەرگەکان بۆ هەمەدانی بە وردی بۆ باس کردم.

لەبڵندایی چیای سوورکێو دانیشتبووین هەواڵیان هێنا کە دووبارە لەشکرکێشی دەستی پێکردۆتەوە. کاتێك بە دووربین روانیمانە لای ماوەت، دیتمان وەك خیزوخۆڵ خەڵك لە هەموو سەرلووتکەکانڕا بەرەو چیای سوورکێو بەڕێوەن. زۆری پێ نەچوو تەقە دەستی پێکردو تاکوو دەورو بەری کاتژمێری سێ، تەقە درێژەی بوو. دیارە ئێمە دوور بووینو نەماندەزانی کوژراو هەیە یا نییە. بەڵام کاتێک ڕەشاش و دۆشکە کاربکا ئیتر بێشك کوژراو برینداری لێدەکەوێتەوە. ئێمە لەنەدیوی تەقەکە بووین دەمان دیت کە پێشمەرگەی پارتی خەریکی هێنانی ئێسترو بارەبەرن بۆسەرەوە. بۆمان دەرکەوت مام جەلال بڕیاری داوە ئیستگای ڕادیۆ و چادر کۆکەنەوەو ڕایان گوێزن بۆ خوارێ، واتە پاشەکشە بۆ گوندەکانی تاژان و تاژەبانی ئێران. کادرەکانی پارتی کە لەلای ئێمە دانیشتبوون بۆیان باس کردین کە مام جەلال گوتبووی داوام لە

مەلا مستەفا کردووە لێمانگەڕێ لەو شاخەبینو لە باوەشی ئێرانمان ناوێ. ئەگەر هەر قبووڵی نەکرد لێرەبین، دەڕۆین و من شەڕی براکوژی ناکەم.
وردە وردە بەرەو تاریکی دەڕۆیی، پێشمەرگەی لایەنی تاڵەبانی تەقەی ڕاگرتو سەربەرەو ژێر بەرەو تاژان داپەڕینە خوار. لایەنی تر گەیشتنە سەر، دەستیان کرد بەڕەگباری ڕەشاشو دۆشکە. ئێمەو پێشمەرگە گەیبووینە خوارو گوللە نەدەگەیشتێ .
ئەو شەوە لە بن دارو دەوەن ڕامان بوارد، بەیانی کە هەستاین دیتمان دەوراندەوری تاژانو تاژەبان بەڕیز سەربازو لەشکری ئێرانی دەورەی داوە. بە مام جەلالمان ڕاگەیاندو ئەویش دووسێ کەسی شارەزای ناردە لامان پێیان گوتین، نیگەران نەبین شەوێ لەو گەمارۆیە دەربازمان دەکەن. بۆشەوێ بەهۆی ئەو پێشمەرگانەی کە خەڵکی ناوچە بوون، لە کێشەی گەمارۆ دەربازکراین. ئێمە پێنج کەس بووین کەهاتینە دەورو بەری مەهابادو... لەبەرگی یەکی بیرەوەریەکانم دا باسم کردووە کە ئێمە دوای دەربازبوون چمان بەسەرهات و بۆکوێ چووین.
بەکورتی من و شەهید قادر شەریف لەگەڵ شەهید مەلا ئاوارەش یەکترمان گرتەوەو لە ناوچەکانی سەردەشتو مەهابادو نەغەدەو شنۆ خەریکی کارو باری تەبلیغاتیو تەشکیلاتی بووین. دوایی بۆ زستانێ هاتێنە گوندێك بەنێوی ورچەك. لەوێڕا پەیوەندیمان لەگەڵ برادەرانی پارتی لە هەمەدان گرت و داوام کرد زارا و شێواو بنێرنەوە ناوچەی سەردەشت. زۆری نەخایاند لەگەڵ یەك دوو بنەماڵەیتری پێشمەرگە کە دەگەڕانەوە سولەیمانی، زاراش گەیشتەوە گوندی بڵەسەن ماڵی حاجی ساڵح. هەواڵیان دامێ و چووم هێنامنەوە گوندی ورچەك. ماڵی خەڵکی ورچەك ئاوەدان بێ، بەتایبەتی ماڵە شێخەکانو ماڵی کاك فەرەج و مام کەریم... وەك کوڕو کچی خۆیان ماڵیان بۆ داناینو یاریدەیان داین. نیزیك

بەساڵێك لەگوندی ورچەك بووین. لە ماوەی ئەو یەك ساڵەدا دوو جار لە شاری سەردەشت ڕا ژاندارم هاتنە سەرمان، هەموو جارێ منو مەلا ئاوارە و قادر شەریف لە دێ دەچووینە دەرو دووراو دوور چاومان لێدەبوو کە دەهاتنە نێو دی و دابەش دەبوون. خەڵکی ئاوایی ئەو خانووەی ئێمەی تێدا بووین چۆلیان دەکردو زارایان ڕادەگوێزت. دوای هێندێك پرسیار لە خەڵك ژاندارمەکان دەڕۆیشتن، ئێمەش یاغر یاغر دادەگەڕاینو دەهاتینەوە نێو دێ. زاراشیان لە گەڵ کەل و پەلی ماڵەکە دێناوەو ماڵیان بۆ دادەنایەوە.

دوو پێشمەرگەمان هەبوو، کاتێك مەلا ئاوارە و قادر شەرێف بۆ جەولە دەچوون هەرکام پێشمەرگەیەکیان دەبردو منو زارا دەماینەوە. ئێمەش بە نۆبە کێشکمان دەدا. زارا زۆر جاران نەخشی پێشمەرگەیەکی هەبوو هەتا ژنی ماڵ. ئەو ماوەی لە ورچەك بووین لەگەڵ خەڵکی ئەوێ وەك خزمو کەسی یەکتریمان لێهاتبوو، کە لەوێ ڕۆیشتین ئێمە زۆرمان خەمی ئەوان بوو.

دوای کۆنگرەی دووهەم، حیزب چەند هاوڕێیەکی ناردبوو کە ئێمە بگەڕێینەوە. ورچەکمان بەجێ هێشت چووینە گوندی هێرۆیە. من دەبوایە دیسان زاراو شێواوی کچم بەجێ بێڵمو بچمە گوندی سونێ کە کۆمیتەی ناوەندی حیزبی دێموکڕاتی کوردستانی ئێرانی لێبوو. هیچ کاتێك ئەو بەجێ هێشتنەی دوایی زارام لەبیر ناچێ کە ئاوا بە پەلە پەل لەو دێیەم بەجی هێشتنو ڕۆیشتم. دیارە ناچار بووم، بەزاراشم گوت پێم خۆش نییە کە ئاوا بەباشی دانەمەزراون بەجێتان دێڵم، بەڵام بۆخۆت دەزانی تائێستا ئێمە لە شۆڕشو تاقمی ئەحمەد تۆفیق قاچاغ بووین و ئێستاش دەبێ بچم بزانم چمان لێدێتەوە. دوای دانیشتنو بڕیاراتی حیزب لە دەرفەتێکدا سەر دەدەمەوە. زارا بە پێکەنینەوە گوتی تا ئێستا لە ترسی ژاندارم و جاشو جووش خەو و خواردنم لێهەڵگیرابوو، ئێستا کە

........................................................................

هاتوومەتەوە ئێرەو ترسم نەماوە، تۆ برۆ خوات لە گەڵ بێ وەدوای کاری خۆت بکەوە، لە هاتنەوەش هیچ پەلە مەکە، ئەوە منیش دیوار بە دیواری خوشکە بەسێم و خەمی منو شێواوت نەبێ.
بەدڵێکی ناخۆش، بەڵام ناچار منداڵەکانم بە جێ هێشتو بەرەو سونێ و بنکەی ناوەندی حیزب کەوتمە ڕێو بۆ شەوێ گەیشتمێ. هاوڕێیان بە تایبەتی شەهیدان کاك سولەیمانی موعینیو کاك صدیق ئەنجیریو هەر وەها تێکڕای برادەران خۆشحاڵ بوون. من هەتا ئەو کات شەهید صدیق ئەنجیریم نەدیتبوو نەم دەناسی، بەڵام بیستبووم کە مرۆڤێکی زاناو شارەزای سیاسییە.
کاک سەدیق گوتی بەگەڕانەوەتان خۆشحاڵین و زۆرمان پێخۆشبوو. کاك فایق باسی تۆو ئاوارەی بۆ کردووم، بەڵام دەڵێی چی لە گەڵ دووبەرەکی. دوای خۆشو بێشو ئەو قسانە گوتی خەریکی کۆبوونەوەینو دەتان بینمەوە. دوای کۆتایی کۆبوونەوە، منو مەلا ئاوارەیان بانگ کردو پرسیان ئێوە ئامادەی کارن یان جاری ئیستراحەت دەکەن؟!
گوتمان ئێمە ئامادەین و بڕێکیشمان پێخۆشە، لەبەر ئەوەی تەبلیغاتی خراپمان لەسەر کراوە پێمان خۆشە سەرێکی ناوچە بدەینەوەو ئەو پڕوپاگاندەی لەسەرمان بڵاو بۆتەوە بیسڕینەوە. بەڵام بەنێوی کۆنگرەی دوو من دەرکراوم، بەپێویستی دەزانم لە بڕیاری نوێی کۆمیتە ناوەندی ئاگاداربم. مەلا ئاوارەش لەو بارەوە هێندێکی پێشنیار دان. صدیق ئەنجیری گوتی کۆنگرە بڕیاری دەرکردنی ئێوەی نەداوە، کاك ئەحمەدە ئەو کارانەی لە پەنامەکی ئێمەدا کردووە. ئێستا کە ئێمە کۆبوونەوەمان بوو، بڕیارمان داوە ئێوە تا کۆنگرەی داهاتوو وەك ڕاوێژکاری کۆمیتەی ناوەندی خەریکی کارو باری ڕێکخستن بن. لە هەموو کۆبوونەوەکانی کۆمیتەی ناوەندیشدا بەشدار دەبن. هەر ئیستا هاوڕێیان خەریکی نووسینی بڕیاری بەرپرسایەتی ئێوەن.

بەکورتی ئێمەش بۆئەوەی گەندکاریەکانی ئەحمەد تۆفیق کە وەك پروپاگاند لەسەر ئێمەی بلاو کردۆتەوە بشۆینەوە، تەمامان گرت بەیانی هەردووکمان بۆ ناوچەی خۆمان بەرەو کاری تەشکیلاتی بڕۆینەوە. ئاوارە بەرەو ناوچەی سەردەشت ڕۆیشتەوەو ئەمنیش دوو پێشمەرگەم بەنێوی خانە لێتان و عوسمان لێتان وەرگرتو نێوم لێنان شێرزادو شێرکۆ. بێ گیربوون بەرەو باڵەکایەتیو لە وێڕا بەرەو سندوسو شنۆ و دەشتەبێڵ کەوتینەڕێ.
ئیتر نەگەڕامەوە گوندی هێرۆ بە زارا بڵێم دەڕۆمەوە، بەڵام هەواڵم بۆ نارد کە وا من ڕۆیشتمەوە ئێران. دیارە بە بەجێ هێشتنی زاراو شێواو ویژدانم ئازاری دەدام، بەڵام بۆ ئەوەی بۆ ئەندامانی حیزبی ڕوون بکەمەوە کە من کادری حیزبم نەك کادری ئەحمەد تۆفیق ئەو کارە بێجێیەم کرد. سەیر بوو، کاتێك دوای چوار شەو و ڕۆژ گەیشتمە گوندی سەردەرێ میوانی سەید وەفا بووم. ناوبراو هاوڕێیەکی نیزیکی حێزبی بوو، دوای چاكو چۆنی بە پێکەنینەوە کوتی تۆ هێچ ئاگات لە براژنە زارا هەیە؟ نەیهێشت وەڵامی بدەمەوە گوتی، ئەویش دوو سێ ڕۆژە لەئاڵیاوێیە! دوای تۆ فڕۆکە هاتووە ئەو گوندەی لێی بوونە بۆمباران کردوە، ئەویش هەڵاتووەو لەگەڵ قاچاغچی ناسیاو هاتۆتەوە. من دوێنێ لە نەغەدە کاك صادقی کاکتم دیتو گوتی ئەو ڕۆژانە لەوانەیە سەعیدی برام بێتەوە لای ئێوە. ئەگەر دیتت پێی بڵێ زارا هاتۆتەوەو ساواك بانگیان کردوم هەڕەشەیان لیکردووم، کە ئەگەر براژنت بڕواتەوە عێڕاق، خەتای تۆیە. منیش کوتوومە پێوەندیم بە سەعیدەوە نییەو کارم پێی نییە. کاکت گوتی سەید وەفا گیان، تۆ بە سەعید بڵێ بۆ لای ئاڵیاوێ نەچێ نەوەك خوا نەخواستە بگیرێ. چونکە بێ شك دەزانم زارا لە ژێرچاوە دێری دایەو سەعید دەبێ زۆر وریا بێت.

کاتێك سەید وەفا ئەو هەواڵەی بۆگێڕامەوە، واقم وڕ مابوو نەم دەزانی چبکەم. بیرم لێکردەوە کە ئەگەر لە ڕاگوێزتنی زارا پەلە نەکەم پاش دە پازدە ڕۆژی دیکە ساواك دەزانێتەوە هاتوومەوە، ئەو کات ڕاگوێزتن مومکین نابێ. شەوی داهاتوو شێرزادو شێرکۆم لەگەل کەسێك بەنێوی عەبدوڵڵا هەڵگرت بەرەو ئاڵیاوێ. لە نیزیك دێ عەبدوڵڵام ناردە نێو دێ کە لە یەک دوو هاوڕێی حیزبی پرسیار بکات ئەگەر هێچ شتێك نەبێ ئێمەش بچینە نێو دێ. دوای خاترجەم بوون، ئێمەش لەپێشەوە چووینە ماڵی زاواکەم عەبدوڵڵا دووکڵاو . زاراش هاتبووە ئەوێ و چاومان پێك کەوتو نەقڵو بەسەرهاتی خۆی بۆگێڕامەوە. زارا زۆر ترسابوو، بەڵام نەی دەویست لاوازی لەخۆی پێشان بدا. لەنێو بۆمباران و تەپو تۆزی تەقینەوەی بۆمبا شێواوی دەرباز کردبوو و هەڵاتبوو چووبووە دەرەوەی هێرۆ. مەلا ڕەسوول پێشنەماز لەگەڵ قاچاغچیەکی خزمی خۆیانی ناردبۆوە مەهابادو لەوێرا دەچێتە نەغەدە و کاکم دەینێرێتەوە ئاڵیاوێی ماڵی باوکی.
زۆرمان تەگبیرکردو سەرئەنجام پلانمان دانا دە پازدە ڕۆژی تر لە لای دایکی بێ، هەتا لەو ماوەیەدا من کارەکانم تەواو کەمو کاتێك هەواڵم دایە خۆی ساز بکا ئێمە پیاوێكو ئەسپێك پەیدا دەکەین و دێین هەڵێ دەگرین و پێکەوە یەکشەوە ئاوای ئەو دێو دەبین و لە گوندی خەلان خانوو دەگرین و لەوێ دەبینو ناچینەوە هێرۆ .
لەسەر ئەو قەرارە زارام بەجێ هێشت و نەمتوانی شێواویش ببینم، بە پەلە ئاڵیاوێمان بەجێ هێشتو شەوێ چووینە گوندی دێشەمس ماڵی کاك مەولوود لێتان. هەمیشە ماڵە لێتانەکان چ لە شنۆ چ لەسندوس بنکەی ئێمە بووەو کوڕەکانیان لە ئیختیاری کادری حیزبیدا بوون، وەك پێشمەرگەی نێوخۆیی کەڵکیان لێوەرگیراوە.
باسی سیاسیو تەشکیلاتی بەجێ دێڵمو دەگەڕێمەوە سەر بیرەوەری تایبەتیکە بەڵێنیم داوە بە منداڵەکان، کورتەی

بەسەرهاتی ژیانی دەربەدەریمان بێنمە سەر کاغەزو پێشکەشیان بکەم.

دوای ئەوەی لە شنۆو سندوس ئەوانەی پێویست بوو بیان بینم و ئەوەی پێویستە بکرێ، کراو پاشی یەك دوو حەوتوو هەواڵماندا بە زارا خۆی ئامادەبکا، ئەو شەو دێین و دەڕۆین. شەوێ چووینە دێ زاراو شێواومان سوار کردو ڕێگای زینوێی شێخیمان گرتەبەر. پێشی خۆڕهەلات گەیشتینەوە خەلانو ماڵمان داناوە. دیارە لەو نێوەدا زارا زۆر نارەحەتو نیگەران بوو، ئەوەی خەم بوو خواردی، بەلام لەو سەفەرە ئیجباریەشدا نیزیك بە١٩ ڕۆژێك لای دایك و براکانی بوو، توانی خزمو دەستە خوشکەکانی پاش چەندین ساڵ ببینێ و دیداریان لەگەڵ نوێ بکاتەوە. گەلێك جار لەو سەردەمدا دادەنیشتینو پێدەکەنین و پێمدەگوت (عدو شود سبب خیر گر خدا خواهد) واتا ئەگەر خوا بیهەوێ دوژمن دەبێتە هۆی خێر.

ئەو دیدارەو دیتنی دایكو براکانی زۆر پێخۆشبوو. دیارە من کە هاتو چۆی ڕۆژهەلاتم دەکرد هەموو جارێ هەواڵی سەلامەتی ئەوانم بۆ زارا دێناوەو ئی زاراشم بۆ ئەوان دەبرد، هەرچەند دیتنو بیستن لێك جیاوازەو دە جار بیستن بە جارێك دیتن ناشێت. دیارە هاتنەوە لای یەکترو پێکەوە ژیان خۆشتر بوو لە دووری یەکتری، بەلام هەردووکمان بەهێنانەوەی زارا بۆ باشوورو گوندی خەلان پەشیمان بووین، چوونکە بەڕاستی باشوور لەوکاتەدا بۆ ژیان نەدەبوو. بۆمبارانو کوشت و کوشتاری فڕۆکە میگەکانی رژیمی بەغدا ژیانیان لە کورد تێك دابوو. دەبوایە شەوەکی دەرپەڕیباینو بەپەلە خۆمان گەیاندبایە نێو ئەشکەوتەکان. بەهەرحاڵ گەڕابووینەوەو کار لە کار ترازا بوو، چارە نەبوو دەبوایە وێڕای خەڵك لەگەڵ هەلات و خۆ شاردنەوە بسازێین. بۆمباران و شەڕ بەڕادەیەک توندو تیژ بوو، تەنانەت نەدەکرا بچمە سونێ و ڕاپۆرتی کارو سەفەرەکەم بدەمەوە. تا

..........................................................................

کاتی گەیشتنی زستانو هەورو باران، کەس ئاسوودەیی بە خۆیەوە نەدیت.

هەروا ڕۆژو مانگو ساڵەکان دەڕۆیشتنو لەو لاوەش شەڕو پێکدادانی ڕژیمی بەعسو پێشمەرگە درێژەی هەبوو. ڕۆژانی سەختو پڕ لەکوێرەوەریو برسیەتیو هەژاری گەلی ستەم دیتوو، هەر دەهاتو تێدەپەڕی. کوشتو کوشتار ساڵێك دووساڵ دەساڵو... مەگەر ئەو گەلە بێپشتو پەنایە تاکەنگێ دەتوانێ بێپشوودان ئاوا هەناسە ساردو بێهیوا لەگەڵ ئەو تراژیدیایە هەڵبکاو مندالّی ڕەشو رووتی بەبێ قوتابخانە و بەنەخوێندەواری رۆژو مانگوساڵ بەرێتەسەر؟!

کاتو سەردەمی ١٩٦٨ی زاینی ١٣٤٧ی هەتاویە. کوردی ڕۆژهەڵات بەهۆی دەسەڵاتدارانی شۆرشی باشوور کەوتە ژێر گوشاری ساواکی ئێران و ئەو پەڕی توندوتیژی لەگەڵ دەکراو بۆیان دانابوو، نابێ چەکی پێبێ، ئێران پێی ناخۆشە! دەبێ نیزیك سنوور بەجێ بێڵن ساواك پێیناخۆشە! دەبێ بنکەکان کۆکەنەوە ساواك ڕازی نییە... ئیتر بەدەستوری ساواك ئەو کوردانەی دژی ئێرانن پێویستە بە جۆرێك بەچۆك دابێن . هەروەها بە ئاشکرا ڕاو دەنران، تەسلیم دەکرانەوە بۆ شکەنجەگاکانی ساواكو ئێعدام کردنیان لە پادگانی جەڵدیان. تەنانەت کوشتن بەدەستی خۆیی باوبوو و مەیتی شۆرشگێڕان دەدراوە بە ساواکی ئێرانو... هتد.

ئیوارەیەکی درەنگی پایزێ لەخەلان لە ماڵی خۆمان لەگەڵ هاوسەرم دانیشتبووم، هاوسەرم زارا بانگی کردم گوتی لە پەنجەرەوە بڕوانە و بزانە ئەو پۆلە چەکدارە چن؟ کە ڕوانیم بارزانیو ژاندارمی ئێرانی بوون. هەروەها چەند کەسێکی شەخسی، یەکێکیانم ناسی ئەویش ئاڕەحمانی شێلم جاڕان بوو کە گەڕابۆوە ئێرانو ببوو بەجاش. دیارە شەخسیەکانی دیکەش وەکوو ئاڕەحمان جاش بوون. لەبارزانییەکانیش تەنیا غەزالیو

ئەحمەد حاجی بۆ من ناسراو بوون. ئەوانی دیکەش ژاندەرمەی ئێران بوون. پێم سەیر بوو ئاوا بە تێکەڵی بە نێو گوندی خەلانێدا بۆلای گوندی ئالانێ هەڵدەکشان.

لەپێشخانەڕا کۆنە دەرگایەکی بە بەرد گیراوی لێبوو، زارا پێشنیاری پێکردم لەوێ ڕاوەستم، ئەگەر ئەو جەماعەتە ویستیان بۆ لای ماڵی ئێمە بێن، بەقەولی خێزانم پێلاقەیەکی پێدادەمو بەپشتەوەدا کە ماڵی کاك عەبدوڵڵا بوو دەرچمو بڕۆم.

زۆری پێ نەچوو لەلای گوندی ئالانێڕا دەنگی چەند تەقەیەك هاتو بێدەنگ بوو. هەمووی سەعات و نیوێکی کێشا، دیاربوو بە تەپەتەپو خشەخش گەڕانەوە.

زارا لە بەر پەنجەرەی راوەستابوو زوو زوو بە ئاماژەو سرتە لە دیمەنی دەرەوەی ئاگادار دەکردم، ئەوەی دەیدیتو لێی دیار بوو بۆ منی باس دەکرد.

چەند کەسێکیان بە دەست بەستراوی پێبوو، کەسێکیان سواری ئەسپ کردبوو دەینالاند، وا دیار بوو بریندارە. دیارە من ناڵەو شتم گوێ لێ نەدەبوو، زارای هاوسەرم کە لە بەر پەنجەرە راوەستابوو زوو زوو ئەو دیمەنەی بۆباس دەکردم. ئەمن لەپێشخانەی بەچەکەوە راوەستا بووم، بەقەولی خێزانم ئەگەر ویستیان بۆلای ماڵی ئێمە بێن، پێلاقەیەك بەو کۆنەدەرگا گیراوە دادەمو لە پشتەوە ڕا بەماڵی کاك عەولا دا بۆی دەرچمو بڕۆم. کاتێك لە نێو گوندی خەلان ڕەت بوون و خەڵك هاتنەدەر، هەواڵمان وەرگرت کە تاقمێك پێشمەرگە چووبوونەوە ناوچەی لاجانێ، لەگەڕانەوەدا لە پشت گوندی دەلاوان ژاندارم دەیان بینێو تەقەیان لیدەکا. بۆمان ڕوون نەبۆوە کە ئەوانیش تەقەیان کردووە یان نا. کاتێك ژاندارم دەزانێ ئاوای باشوور بوون، تاقمێك جاشو ژاندارمە خۆیان ئامادە دەکەن دەچنە حاجی عومەرانو دەڵێن چەتە هاتوون تەقەیان لە پادگان

کردووه، هەر ئێستا ئاوای ئێره بوون دەبی بیانگرین!! غەزالی کە بارزانیەکی بەرپرسی سنوور بوو لە حاجی عومەران، هەروەك فەرمانی ژاندارمی خوێڕی بەئەرکی خۆی بزانێ، دەسبەجێ پیاو دەنێرێتە ئەو دێیانەی دەورو بەر تا بزانن لەکوێنو چوونەتە چ گوندێكو چ ماڵێك. کاتێك هەواڵ وەردەگرن کە چوونەتە ئالانێ ماڵی حوسێن ئاغا، بەپەلە لەگەڵ چەند بارزانیەك ئەو ژاندارم جاشانەی لەخانێڕا هاتوون سواری دوو ماشێنی لەندرۆوەر دەبن و بەرەو گوندی ئالانێ وەڕێدەکەون و لەوێ دەوری ماڵی حوسێن ئاغا دەدەن کە پێشمەرگەکانی لێ بوو. لەپێشدا پێشمەرگە تەقە دەکەن، غەزالی دەڵێ تەقە مەکەن تەنیا پرسیارتان لێدەکەین کارمان پێتان نییە. پێشمەرگەکان داوا لە غەزالی دەکەن بە سەری بارزانی سوێندمان بۆ بخۆن تەسلیم دەبین. غەزالی دەڵێ بە سەری مەلا مستەفا ئێوە لە ئەماندان. پێشمەرگەکان باوەڕیان پێدەکەنو تەسلیم دەبن، هەر دێنەدەر دەستیان دەبەستنو وەپێش خۆیان دەدەن. وەك باسم کرد بە خەلانێدا هێنایانن و هەر ئەو شەوە بێ ئەوەی برینداره‌کە دەرمان بکەن، تەسلیمی جاشو ژاندەرمەکانیان دەکەن. کە دوایە زۆری پێنەچوو هەر پێنجیان واتە عەلی گوێ ڕەش و چوار هاوڕێکانی لە پادگانی جەڵدیانێ ئێعدام کران.

نەمدەویست بچمە نێو ئەو باسە سیاسیەوە، تووش بووم. من مەبەستم بیر کردنەوەی زارای هاوسەرم بوو کە گوتی دەبێ ڕانەوەستمو تەسلیم نەبم، بەڵکوو دەبێ دیوار کون بکەم و بەچەکەوە بڕۆم. دیاره لە خۆڕا ناڵێم زارا تەنیا ژنی ماڵێ نەبوو. بۆ سبەینێ لێم پرسی ئەگەر هاتبان من دەرباز دەبووم؟
لە وەڵامداگوتی، چەکت پێ بوو لانیکەم بە حیزی نەدەگیرای بەزەجر لەژێر لێداندا بتکوژن.

من كه دەنووسم زارا هەر ژنی ماڵێ نەبوو نەخشی پێشمەرگەیەكی شۆرشگێری هەبوو، لەخۆڕا وانالێم.

## چەند زەنگێكی خەتەر!

له دەورو بەری زینوێو خەلان واتە نیزیك سنووری ئیران كەسانێكی كه سیاسی بن و جیگای شك لێكردنی سیاسی بن نەمابوون، تەنیا كەسانێكی كه وەك كادری تەشكیلاتی بنو، حیسابی ئەوەیان لەسەر بكەن حیزبینو سیاسین، مەلا محمدی خزریو ئەمن مابووین. بۆخۆمان زۆرجار دەمانگوت مەترسی نیزیك بۆتەوە، پێمان وابوو خۆمان كه بەباڵتۆ فرۆشتن سەرگەرم كردووە، كەس كاری پێمان نییە. بەڵام ئەوەی ڕاستی بێ خۆمان فریو دەدا كه بەڵێ گۆیا وازمان لەسیاسەت هێناوەو ئێران كاری پێمان نەداوە!

لەسەر بانگ كردنی كاك كەریم حیسامی بۆ بەغدا، لەگەل مەلا محمد ڕۆیشتین. واز لەوەش دێنم كه تا چووینو هاتینەوە له بەر دەركی وێستگەكانی پشكنین چەند جار گیراینو هینایانینه خوارو هەرجارە بە جۆرو حاڵێك رزگارمان دەبوو.

بەڵی له بەغدا شەهید دوكتور قاسملوو، دوكتور ڕادمەنێش سكرتێری حیزبی تودە، كاك كەریم حیسامی، شەهید سولەیمان موعینی و محمدامین سراجیمان دیتو پاشان بە دەردەسەریەكی زۆرناخۆش گەڕاینەوە. بەڵێنیم دابوو مەگەر تووش بم، دەنا باسی سیاسی نەكەم، بۆیە له دانیشتن و باسو خواسی ئەو سەفەرە خۆم پاراست.

مەلا محمد ڕۆژێك پێش من گەیشتەوە خەلانو هەر بە گەیشتنەوەی دەگیرێتو دەیبەنە زیندانی خەلانێ. من كه هاتمەوە دڵخۆشی براژنە تووبای هاوسەری مەلا محەمەدم

دەداوە کە سبەینێ دەچمە مەکتەبی سیاسیو ئازادی دەکەم. کەچی بۆ شەوێ هاتبوون منیش بگرن! ماڵی وەستا مەحمودی خەیات ئاوەدان بێ هات پێیگوتم؛ ئەوە دەستەیەك پێشمەرگە لەماڵی ئێمەن هاتوون بتگرن، منیان ناردووە بزانن لە بەغدا هاتوویەوە. هەستە برۆ، منیش کەمێك خۆم دەخافڵێنمو دەچمەوە دەڵێم نەهاتۆتەوە!

هەر ئەوەندەم پێکرا بەغار ئەو هەواڵە ناخۆشە بە زارا بدەمو بڵێم بەداخەوە هاتوون منیش بگرن، نیگەران مەبە وا من ڕۆیشتم. هەر بەو غارو هەڵاتنە بەرەو ئالانێ لای مارفی هاوڕێم غارم دا.

بەیانی بەکاوەخۆ هەواڵم نارد بۆ زارا کە من سەرم هەڵدەگرمو دەڕۆم نامەوێ بەهێچ جۆرێك بگیرێم، چوونکە گیرانی ئێستام زۆر بەزەرەر تەواو دەبێ. نێگەرانیش نەبێ لەوەی دەچمە کوێ.

دەوری مانگێکی پێچوو کە من و مەلا محەمەد خۆمان لە نەغەدەو سابلاغ دیتەوە. دوو کەسی سەرسەختی کە هەرگیز نەدەبوایە سەرشاخو بن بەردەکانی قەندیل و بارزین بەجێ بێڵن، بەڵام با خوێنەر بۆ خۆی بیری لێ بکاتەوەو بزانێ چ دەورانێك بووە گوشار و حوکمی ئەو کاتو بەڕێوەبەرایەتی ئەوکاتی کوردستان کێ کردویە؟

سەعید کوێستانی کە ئەو هەموو سەختیو ناخۆشیەی دیوەو لە گەڵ ئەو هەموو سەرماو گەرمایەدا بەربەرەکانی کردووە، سەرئەنجام ناچاریان کرد کە واز لە خزمەت بە نیشتمان و پێشمەرگایەتی بێنێ و بچێ لە نەغەدە پاڵ داتەوە و دانیشێ.

هەر لەو سەردەمەدا بوو، "شیرین" کە منداڵی سێهەم بوو لەدایك بوو.

## دەورانێکی تری نوێ

دوایی مردنی وریای کوڕم و خەم و پەژارە، کوڕێکمان بوو، نەنکی واتە دایکی زارای هاوسەرم پێشنیاری کرد نێوی بنێین مراد، زاراش هەر ئەو نێوەی پێخۆش بوو، بۆیە نێومان نا مراد.
ساڵی ١٣٥١ی هەتاویەو جارێکی دیکە لەگەڵ مەلا محمد لە نەغەدە جیرانی یەکترین‌و ڕازو دەردی دڵمان وێگڕایەو شەوانە کە دەکەوینە لای یەکتر خەمەکانمان هەڵدەڕێژین.
ئەو وەك بەرپرسی کورەخانە لەلای میرزا ڕەحیم خەرازی گیرسابۆوەو منیش خەریکی کاروباری وێنەگری بووم‌و ژیانێکی تابڵێی خۆشم پێك هێنابوو. وردە وردە بووم بە خاوەن خانووی خۆم‌و خاوەن ماشێن‌و فرۆشیاری کەل‌وپەلی پێویستی عەکاسی‌و شاگردو مشتەری‌و وەرەو بڕۆیەکی ساماندارانە و... هتد.
هەر لەو دەورانەی نەغەدەدا کوڕێکی ترمان بوو، نێومان نا ئازاد. لەگەڵ ئەوەی دا کە بنەماڵەکەمان گەیشتبووە شەش کەس و تا ڕادەیەک ڕازی بووین لە ژیانی ڕۆژانەمان کە لانیکەم ئەو زەجرو زەحمەتانەی لەو چەند ساڵانەی ڕابردوو دا من و زارا چێژتوومانە پڕ دەبێتەوەو دەکرێ بەخۆمان ڕابگەین.
لەو سەرو بەندەدا وەک منداڵی پاشەرۆک واتە چووکترین منداڵی بنەماڵە، فەرهادی کوڕمان هاتە دنیاوە.
بەڵام وا دیار بوو ڕژیم وازمان لێ ناهێنێ و جارو بار بە بەهانەی جۆر بە جۆر لەژێر چاوەدێری گرتن‌و لێ پرسین هەیە.
ڕۆژێك لە ورمێ من‌و مەلا محمد هەر لەئوتێل وەدەرکەوتین ماشێنی ساواك گەیشتە سەرمان گیراین. دوای پرسیارو بێنەو بەرە، ئەو جارە بە خێر ڕابردو ئازاد کراین. لەمەهاباد لە ناشتنی عەزیز یۆسفی دەهاتینەوە نێو بازار کە بگەڕێینەوە

نەغەدە، لە گەڵ کاکم ساواك گرتینیو چل و پێنج ڕۆژیان لە زیندان ڕاگرتین.

ڕۆژێك زارا هاتە دیتنم و گریا، کاتێك فرمێسکەکانی زارام دیت هەموو ڕابردووی پڕ لە غەمو خەفەت و ئاوارەیی ناوبراو وەك فیلم بە بەرچاویدا تێپەڕی. منیش بێ ئیختیار وێڕای زارا فرمێسکم هاتە خوار و گریام. دوای ئازاد بوونم لێم پرسی ئەرێ زارا ئەوجارەی بۆ مەلاقاتی من هاتییە زیندان بۆگریای؟ گوتی لە پڕڕا بە مێشکم داهات، تۆی کە بۆ ئازادیت هەوڵدەدا، ئێستا کەوتوویە نێو زیندانێك کە دەرگا ئاسنەکەی بە قوفڵێکی گەورە لەسەرت داخراوە، دڵم لەرزیو زۆرم خەم بووی. بەڵام توخوا سەعید تا دنیا ئاوایەو کورد ئاوا بێ پشتوو پەنایە ڕاوەستەو هەڵتۆز هەڵتۆز مەکە.

پاش ماوەیەك مەلا محەمەدیش لە نەغەدە گیرا، وا بزانم ساواك دووسێ مانگان ئەویشی لە کونەڕەشەی کرد. خەریکی هیچ کارێکی دژی شاهەنشاهی نەبووین بێجگە لە سرتەو گێڕانەوەی هەواڵی ڕادیۆ ئەویش هەر بەسرتە. لەسەر ئەو حاڵەشڕا بەدوامانەوە بوون وازیان لێ نەدەهێنایین. زۆرجاران زارای هاوسەرم ئامۆژگاری دەکردم کە واز لە سرتەو خورتە بێنم، زۆریش بەمەنتقی لە گەڵم دەدواو دەیگوت تۆ لە بیرت نییە کوردەی خۆماڵی چی بەسەر هێنایو چۆنی ڕاونای؟ ئێستا کە هیچ ڕووناکی شك نابەی، لەخۆڕا بۆ خۆت تووشی زیندان دەکەیو ڕوحم بە منو ئەو منداڵانە ناکەی؟

ڕاستی دەکرد هیچ ڕووناکی بۆ کورد نەبوو، بەڵام ئەمن بەو ئامۆژگاریانەی تووڕە دەبووم. تووڕە بوونیشم لەوە بوو من لەگەڵ هیچ کەسو هیچ شوێنێك پێوەندیم نەبوو. هەموو پێشنیارێك و پێوەندیەکم ڕەت دەکردەوەو خۆم لێنەدەدا.

.....................................................................................

بەڵێ، وردە وردە جمو جۆڵو خۆپێشاندان لەتاران و ئیسفەهانو تەورێزو... دەستی پێکرد. دیسان هەستی نیشتمانپەروەری لە مێشکمدا جووڵاوە. لەژیانمدا من بەئەرکی خۆم زانیوە لەهەر کاتێکدا بۆم بلوێ لە دژی داگیرکەران ڕاپەڕمو ئەوەی بۆم بکرێ بیکەم. کاتێك خۆپێشاندان گەیشتە نەغەدە، نەم توانی خۆم ڕاگرم، ڕەگەڵ لاوەکانی کوردو عەجەم دەکەوتمو وەکوو ئەوان درۆشمم دەدا. بەڵام ئەوکات زارا تەنیا مەرجێکی هەبوو دەیکوت ئەگەر زانیت تەقەیە، ئێحساسات نەتگرێ درێژە بەڕێپێوان مەدەو وەرەوە.

دیتمان شاهەنشاش بەگریان ڕۆیشتو لەولاوە خومەینی لە کەربەلا گەڕاوەو شەڕی نەخوازراوی نەغەدەشیان بە سەردا سەپاندین. قەت لەبیرم ناچێ کە دیسان تووشی ئاوارەییو دەربەدەری بووینەوە. ئەوەی لەو ماوەیەدا پەیدام کردبوو هەموویان بە دوکانەوە سوتاندو منیان لەسەر ساجی عەلی دانا. بۆ تاقە یەکجاریش زارای هاوسەرم بە چاوی دانەدامەوەو نەیگوت واز لە سیاسەت بێنە. ئەو دڵخۆشی منی دەداوەو دەیگوت خەم مەخۆ، چۆنمان پەیدا کردبوو، دیسان دەتوانین هەوڵ بدەین وەدەستی بێنینەوە. بەکورتی تەنیا ماشێنەکەمان مابوو کە کاری پێبکەین یان بیفرۆشینو بیخۆین. لە سابڵاغێ وردە وردە نێو ماڵەکەمان دەفرۆشتو دەمان خوارد. با ئەوەشم لەبیر نەچێتەوە کە لە ئاوارەیشدا من وازم لە حیزب و کاری حیزبی نەهێناو لە کۆنفرانسێکی حیزبیدا لە مەهاباد خۆم کاندید کرد وەك ئەندامی کۆمیتەی شارستانی مەهاباد هەڵبژێردرام.

دوای ئەو کۆنفرانسەو هەڵبژاردنە ڕۆژێك زارا پرسی وا دیارە بەتەما نیت بچیەوە نەغەدە، بۆیە دیسان کاری حیزبی و بەر پرسایەتیت وەرگرتۆتەوە؟!

..............................................................................
ئەو پرسیارە منی بردە نێو بیرێکی قووڵو بیرم لێ دەکردەوە. لە خۆم دەپرسی؟ زارای هاوسەرم هیچ کاتێك قسەیەکی نەکردووە کە من لە خەباتو تێکۆشان سارد کاتەوە، ئەو پرسیارەی جێگای بیرکردنەوەیە. کاتێك سەرم داخستبوو بیرم لە نەغەدەو مەسەلەی سوتانی دووکانو کارو وێنەگری خۆمو ڕابردو دەکردەوە، گوتی سەعید گیان پرسیارێکی خراپم کرد بۆیە وەڵامم نادەیەوە؟ گوتم نا خراپ نەبوو، بیرم لەوە دەکردەوە، چوار پێنج ساڵ لەوە پێش پێتگوتم هیچ ڕووناکایەك نییە خۆت بەگرت مەدە روحم بەمندالّەکان بکە. ڕاستت دەکرد حەقت بوو، بەڵام ئێستا منو تۆ دانیشینو یەکی دی دانیشێو هاوارێك بۆ ئەو گەلە لێقەوماوە نەکرێ، پێت وا نییە خەسارەتێکی گەورەیە؟

قەت لەبیرم ناچێ کە زارا بەو قسەیە گریاو گوتی بە خوای وایە سەعید گیان، ئێستا چۆنت پێ باشە وا بکە، تازە ئێمە جەوانیەکەمان چووە ئەگەر بۆخۆت پێت دەکرێو دەتوانی، لەلایەن منەوە پشت ئەستوور بەو بڕۆ بیکە. بەکورتی دەبێ بڵێم لە مەهابادیشیان دەرپەڕاندین و چووینە کاوڵانی گەورکان. لە کۆنگرەی پێنجی حیزبی دێموکڕاتی کوردستان دوکتور قاسملوو داوای لێکردم بۆ کۆمیتە ناوەندی خۆم کاندید کەم، دوای دەنگ هێناوە بەرپرسایەتی ناوچەی سەردەشتم پێ ئەسپێردرا.

لە ماوەی ئەو دووساڵەی کە لە سەردەشت بووین زارا خەمێکی زۆری خوارد. ناحەقیش نەبوو، هەرکاتێك دەمانویست لەبنکەی کۆمیتەی شارستان لەشوێنێکی ئەمنو ئارام بین، شەیتانو شۆڤاری دەورو بەری دەفتەری سیاسی دوکتور قاسملوویان ناچار دەکرد، نامەیەك بنووسێ دەستووری کشانەوەی بنکەی بۆ نێو قووڵایی وڵاتمان پێ ڕابگەیەنێ.

زارا بەوە زۆر قەڵس بوو کە بۆخۆیان لە سەت کیلۆ مەتری باشووری عێڕاق دوور لە سنوور بن، بەڵام کادرێکی کۆمیتە ناوەندی مافی ئەوەی نەبێ لە دۆڵی دووبێ نێوان سنووری ئێران و عێڕاق چادرێك هەڵداو لە نێو مارو موور بسەکنێت.
زارا بەو فەرق و جیاوازیە زۆر زۆر نارەحەت بوو. تەنانەت شوێنی لەسەر منیش دانا کە لە کۆنگرەی شەش خۆم کاندید نەکەم. چونکە مرۆڤ بەرپرس نەبێ پێویست ناکات لەکاتی خەتەردا موو بەموو بڕیاری ڕێبەرایەتی بەڕێوە بەرێ.
دوای کۆنگرەی شەش چووینە قەڵادزێ وەك نوێنەری حیزب نیزێك ساڵێك ئەرکی پێ ئەسپێردراوم بەڕێوە برد. پاشان وەك ئەندامی کۆمیسیۆنی تەشکیلات چوومەوە دەفتەری سیاسی. دەکرێ بڵێم دیسکی پشتم وردە وردە لەکاری خستبووم . سەرەڕای ئەوەش شەڕی بێمانای نێوان حیزبو کۆمەڵە زۆری ناهومێد کردبووم.
لەوێڕا زارا کەمتری من هاندەدا درێژە بە خەبات بدەم. دووسێجاری بە گوێم هەڵێنا کە ئەو دوکان و خانووەم بفرۆشم کارێکی پێبکەین. سەرئەنجام دوکانەکەیان بۆ هەرزان فرۆش کردم. ئەویش لەجیاتی کاسپی پێکردن، پێی هاتینە دەر.

## سەرهەڵدانی بیرێکی نەخوازراو!

کاتێك هاتمەوە کۆمیسیۆنی تەشکیلات، ماڵ و منداڵەکانیشم هێنا شارۆچکەی کارێزەو بۆخۆشم هاتووچۆی دەفتەری سیاسی، یان بەقەولی هاوڕێیان دۆڵی دێموکڕاتم دەکرد. نێوانی کارێزەو دەفتەر بە پێیان دوو سەعاتێك دەبوو. جارو بار ماشێنیش هەبوو مرۆڤ سواربێ. خەڵکی گوندی کارێزە لەگوندەکانی دەورو بەری سنوور را رژیمی بەعس بەزۆرە ملی هێنابوونیو لەکارێزەی

کۆکردبوونەوە. خەڵکێکی نەخوێندەوارو ناحاڵیی بوون، پێیان وابوو ئێمە هەموومان پیاوی رژیمی عێراقو بەعسین، بۆمان حاڵی نەدەبوون. دیارە ئیواشیان تێدابوو کە ئاوا بیر نەکاتەوە. چەند کەسێك وەك هەیئەتی کۆمیسیۆنی تەشکیلات لەگەڵ مەلا حەسەن رستگار سەفەرێکی لای سێدەکانمان ڕێکخست. دواى چەند شەوو ڕۆژ گەڕاینەوە.

لەو شارۆچکەیە دزی زۆر دەکرا. من کە دەچوومە جێیەك دەمانچەیەکم هەبوو بۆ زارام بەجێ دەهێشت پارێزگاری خۆی پیبکا. کاتێ دەزانن من لەماڵێ نیم، شەوێ دزێك دەچێتە دیوێکی کە دەیزانی کاتێك من لەماڵێ نیم ئەو دیوە کە وەتاغی میوانان بوو چۆلە. زارای هاوسەرم کاتێك من لەماڵ نەدەبووم، نیوەی شەوەکەی بە خەبەر دەبوو نەدەنووست، بەکەلێنی دەرگادا دەبینێ ئەوە یەکێك هاتو بەکلیل دەرگای کردەوە. زاراش دەمانچەکەی ئامادە دەکا، کە دێتە دەر، ڕاوەستەو تەقە لیکردنی یەك دەبێ. کوڕە لەوێ دەکەوێو لاقی بریندار دەبێ. زارا لێی دێتەدەرو دەگوڕێنێ و بەسەریدا دەقیژێنێ:

ـ ببزووی دەکوژرێی!

هەرای دەرو جیرانان دەکاتو خەڵك دێن. ئەوکات وتوو وێژی یەکێتیو ڕژیم لە گۆڕێدا بوو پێشمەرگەی یەکێتی لەدەوروبەری کارێزە بوون. زارا بەو خەڵکە دەڵێت ئەگەر ئیزنتان لەسەربێ، ئەم دزە تەسلیم بە یەکێتی دەکەم. خەڵك دەپاڕێنەوە بەئێمەی ببخشە، کاتێك سەعید هاتەوە هەر چۆنی پێی باشبوو وادەکەین. کوڕەی دەبەن دەرمانی دەکەن.

کاتێك من هاتمەوە خەڵك هاتنە تکاو ڕەجاو، وەك دەڵێن "کابرا لە کیسەی خەلیفە دەبەخشێ" منیش کوڕەم بەخشی. لە نێو گوندی کارێزە دەکرێ بڵێین نیزیك حەوت هەشت مانگ بوو زۆربەی شەوان خەڵك شتی لێدەدزراو دەرگای ماڵانیان

دەشکاندن، دیارە ئەو ماڵانەی دزی لێدەکران لەماڵێ نەدەبوون، بەتایبەتی ماڵی ئەو کوردانەی کە پێشمەرگەو قاچاغ بوون. خەڵکی کارێزە کردبوویانە پڕۆپاگاند کە ئەو دزیە کاری کوردەکانی ئێرانەو لەوان زیاتر کەسی دیکە نییە. ئەوەندەیان ئەو تەبلیغاتە دووپات کردبۆوە ئێمەش مەشکوك ببووین، پێمان وابوو ڕاستە. زارا لە کاتی گرتنی دزەکە، بە دەیان کلیلی لێگرتبوو. دوو حەوتووش پێ چوو بوو خەڵك هەر دەهات کلیلی خۆی دەناسیەوە و دەیبردەوە. ئەو کلیلانە کارێکی وایکرد خەڵك داوای شتی خۆیان لەو کوڕە بکەنەوە، هێندێکیشیان دەستیان کەوتەوە. دیارە ئەو کوڕە بە تەنیا نەبوو، چوار پێنج کەس بوون کە یەکیان گرتبوو، بەڵام لەگەڵ تەقەکە ڕەفیقەکانی هەڵاتبوون. لە هەمووی سەیرتر دوای ئەو ڕووداوە ئیتر دزی لە کارێزە نەکراوەو خەڵکی کارێزە هەر دوعای بۆ زارا دەکرد بەو کارەی کۆتایی بەدزی هات.

## بیرۆکەی سەفەرێکی چاوەڕوان نەکراو!

دیسكو پشت ئێشە فزەی لێبڕی بووم، لەلایەکی دیکەشەوە شەڕی ماڵوێرانکەری حیزبو کۆمەڵە لانیکەم منی لەخەباتو تێکۆشان سارد کردبۆوەو لە دڵی خۆمدا تەمای ئەوەم گرتبوو کە بەرەو ئوروپا کوردستان بەجێ بێڵم. یەك دوجار بەبێدەنگی ئەو باسەم لەگەڵ زارای هاوسەرم هێنا گۆڕێ و پێم خۆشبوو لانیکەم لەبارەی سەفەرێکی ئاوادا زارا هاوبیرم بێ، چونکە بەڕاستی نەمدەویست منداڵەکانم بزانن‌و لەخوێندنەکەیان سارد بنەوە. کاتێك ئەوەم لەگەڵ زارا باسکرد، سەری ڕاوەشاندو گوتی سەعید قەتقەت تۆ نابێ بیر لە شتی وابکەیەوە خەڵك پێت بڵێن حیزبو خەباتو تێکۆشانی بەجێ هێشت و...

ئامۆژگاریەكی زۆری كردم، پێمخۆش نییە بینووسم. دوو جار بۆ چارەسەری دیسكەكەم سەفەری بەغدام كردو دەیانگوت دیسكت هەیەو دەبێ نەشتەرگەری بكرێی. كاتێك دەمڕوانیە ئەوانەی دیسكیان عەمەل كراوەو خراپتر بوونە، منیش لە نەشتەرگەری پەشیمان دەبوومەوە. ڕۆژێك كە كاك ئەحمەد حەداد لە سلێمانی بردمیە لای دوكتورێكی بە نێوبانگ بە ناوی ئازاد، دوای وێنەگرتن دوكتور گوتی تۆ نەشتەرگەریش بكرێی چاك نابیەوە. كاتێك هاتمەوەو قسەی دوكتورم بۆ زارا گێڕاوە، زۆری پێناخۆش بوو. گوتی چارە چییە. لە وەڵامدا گوتم چار ڕازی بوونی تۆیە بچینە ئوروپاو پێم وایە لەوێ چارێك هەیە. یادی بەخێر بێ زارا، بەو قسەیەی من ئەوەندە پێكەنی شینو ڕەش هەڵگەڕا! پرسیم بۆ پێدەكەنی، گوتی پێم سەیرە ئاوا ڕەزایەتی منت مەبەستە! بڵێ بزانم تۆخوا هەمیشە بۆخۆت شتێكت پێ باش بووبێ نەتكردووە؟ كوا لەسەر ڕازی بوونی من ڕاوەستاوی. ئێستاش سەعید گیان! ڕاستە من زۆر دژی بەجێ هێشتی كوردستانم، بەڵام كە ئێستا لێرە چارت نییە، پێمخۆش نییە زەلیل بی، هەرچی دەكەی بیكە!

بەوەرگرتنی ڕەزایەتی زارا ئەو جار لای منداڵەكانیش ئاشكرامان كرد كە كارێزە بەجێ دێڵینو تەمامان گرتووە دەڕۆینە دەرەوە. تازە لەوە نەدەترساین كە منداڵەكان لە خوێندن سارد بنەوە. بە هۆی مرۆڤی خێرخواز دەست بەكار بووم بۆئەوەی ڕێگامان بۆ خۆش بكەنو لە عێراق دەر بچین.

## میوانی کاك سەید ڕەسوڵ!

زیاتر لە پێنج شەش مانگ خەریکی جێبەجێ کردنی ئیجازەو چونەدەر لە عێڕاق بووم. چوار پێنج کەڕەت چوومە بەغدا لای کاك سەرداری جاف بۆ ئەوەی ئیجازەم بۆ وەربگرێ تا بتوانم لەگەڵ بنەماڵەکەم عێراق بەجێ بێڵم. هەردەهات و ڕۆیشتنمان نیزیك دەبۆوە. هاتینە سەر ئەو ڕایە کە ئەگەر لەپڕڕا تەلەفونم بۆ بکەن زووبگەمە بەغدا، چۆن دەبێ؟ چوونکە لە شارۆچکەی کارێزە دەکرێ بڵێم حاسێ ببوومو تا وەرەقەیەکم بۆ سولەیمانی وەردەگرت دەبوایە حەوتخوانی ڕۆستەم بکەم! لەلایەکی دیکەوە، هەر بۆ شاری سولەیمانی پێویستمان بە وەرگرتنی وەرەقەی ئیجازەی حەوت کەس بوو کەپێی لە کارێزە دەرباز بین، جا چ دەگەیشت بەوەی کە لە سولەیمانیڕا بڕۆینە بەغدا. حەوت کەس بریتی بووین لە منو زارا، کوڕەکانم موراد، ئازاد، فەرهاد. هەروەها حوسێنی ئازەری زاوام و شیرنی کچم کە خێزانی ناوبراو بوو.

بیرم لێکردەوە بچمە لای سەید ڕەسوڵی بابی گەورە ڕاوێژێکی لە گەڵ بکەم، بەڵکوو بتوانێ چارەسەرێکم بکا. سەید ڕەسول نەك هەر بۆ من بەڵکوو بۆ هەموو کەس فریشتەی نەجات بوو. هەر کەسێك کاری بەو بابەو داوای یارمەتی کردبایە، هەرچی پێیکرابایە دریغی نەدەکرد. بەتایبەتی من کە دۆستی نیزیکی بووم دەمزانی یاریدەم دەدات. هەستام چوومە لای لە سولەیمانی. کاتێك سەفەری بەغداو دەرەوەو، هەروەها دووری خۆم لەسولەیمانی بۆ باس کردو پێشنیارم کرد ئیجازەیەکم بۆ وەرگرێ بتوانم خانوێك بگرم تا دەڕۆم، نەیهێشت قسەو پێشنیارەکەم تەواو بکەم، گوتی بیری لێ مەکەوە، من وا لێرە ئەو خانوەی گرتوومە چوار دیوی خەوی هەیە دوو دیوی بۆ تۆ،

سالێکی تێدا بی گوێم لێ نییە. ئێستا دەچم ئیجازەی هێنانی ماڵەکەت بۆ وەردەگرم بۆوەی بتوانی بیانهێنیە سولەیمانی.
کاك سەید ڕەسول دڵی لە هێندێك کەسی ڕێبەرایەتی حیزب ئێشا بوو، لەسولەیمانی دانیشتبوو. پڕوپاگەندەیان بۆ بلاو کردبۆوە کە سەید ڕەسوڵ پیاوی موخابەراتە. کاتێك پێیگوتم دەچم ئیجازەت بۆ وەردەگرم، ئەوەی لە سەریان دەگوت وەبیرم هاتەوە. بەلاّم دوایە دەرکەوت کە شەو و ڕۆژێکی گرت تا برادەرانی کۆمەڵە ئەو وەرەقەیان وەرگرتو دایان بە سەید ڕەسوڵ، ئەویش دای بەمن.
ماڵەکەم هێنا سولەیمانی و نیزیکی حەوتوێك میوانی ناوبراو بووم. سەید ڕەسوڵ لە باری ماڵیشەوە دەست ڕۆیشتوو نەبوو. ئێمە بۆخۆمان خەرجی خۆمان دەکێشا. بەکورتی ئەو تەلەفونەی چاوەڕێی بووم، کردیان کە ئێمە بچینە بەغداو بڕۆینە دەرەوە. خۆمان ئامادە کردو مالاّوایی‌و خواحافیزیمان لەکاك سەید ڕەسوڵ کردو ماشێنمان گرت و سوار بووین خۆمان گەیاندە بەغدا. زارا زۆر نیگەران بوو تا هەڵفڕین‌و لە عێڕاق دەرباز بووین. هێندی زوڵم و زۆری‌و ونبوونی خەڵك لە رژیمی عێڕاق بیست بوو، ناحەق نەبوو نیگەران بێ. بەتایبەتی کاتێك سواری تەیارە بووین و نیزیك کیلۆمیترێك بەزەویدا ڕۆیشت کە هەڵفرێ، ڕاوەستا پاشەو پاش کشاوە هاتەوە جێگای خۆی‌و ڕایانگەیاند چەندا کاتژمێریك ڕادەوەستین چونکە ئێشکالێکی فەنی هەیە. زارا بەو گەڕانەوەو ڕاوەستانە دڵەکوتەی گرت بوو، لەسەر ئەو حاڵەی خۆیڕا بەمنی دەتکوت لەبەر منداڵەکان خۆت نیگەران نیشان مەدە. بەڕاستی تا بڵێێ من نیگەران بووم، پێم وابوو دەمانگێڕنەوە بۆیە تەیارەکە گەڕاوەو ڕاوەستا. بەلاّم بە خۆشی‌یەوە دوای ماتەڵ بوونێکی زۆر دوبارە هەڵفڕینەوە.

کاتێك گەیشتینە سوئێد زۆر خۆشحاڵ بوو لەوەی منداڵەکانی بە سەلامەتی لە عێراق بۆ دەرباز بووە. هەمیشە شوکری خوای دەکردو دەیگوت خودا ڕوحمێکی گەورەی پێکردوین کە ئاوا بە سەلامەتی لەژێر تۆپ باران و بۆمبارانو حوکمی بەعسی ڕزگارمان بووە. ناحەق نەبوو، دوو سێ جار لەژێر تۆپ باران و بۆمباران منداڵەکانی ڕزگاریان ببوو. هەر ئەوە بوو کە کاتێك ئەو ڕووداوانەی وەبیر دەهاتەوە شوکرانەی دەبژارد.

زۆری پێنەچوو، بەداخەوە خەبەرمان پێگەیشت کە کاك سەید ڕەسووڵی بابی گەورە بە دەستی ناپاکێك تیرۆر کراوە. یادی بەخێر و ڕووحی ئەو شەهیدە مەزنە هەر شاد بێ.

دوای نۆ مانگ مانەوە لە کەمپی فاگشتای سوئێد، دایانین بە شاری ئۆرەبرو، ماوەیەك دەچووینە کلاسی زمانو دەرسمان دەخوێند. من پێم وابوو زارای هاوسەرم کە نەخوێندەوارە درەنگ فێری زمانی سوئێدی دەبێ، بەڵام لەمن باشتر قسەی بە زمانی سوئێدی دەکرد.

کۆمۆن واتە شارەداری بە هەموو کەس دەڵێ دەبێ کار بکەی. کارکردن بۆ ئێمە زۆرسەخت بوو. من تەنیا کاری وێنەگریم دەزانی ئەویش بە شێوەی لای خۆمان. ئەو دوکانو شیرکەتانەی دامو دەزگاو کەرەسەی پێشکەوتووی ئێستایان هەبوو، من نەمدەزانیو کاریان نەدەدامێ. ئەو کارانەی کە بۆ تاقیکاری پێشنیاریان پێدەکردم لە توانای مندا نەبوون. لەلایەکی دیکەشەوە زمان زانینی دەویست منیش ئەو زمانەم نەدەزانی. زاراش تەنیا کارێکی پێیان پێشنیار دەکرد، خاوێن کردنەوەو خزمەت بە پیرو نەخۆش بوو، کە بەشێوەی کاتی دەچوو ئەو کارانەی دەکرد. دوایی لەو شوێنەی پاکەت و بارو کەلوپەل دێنێ، بەوتەی خۆیان کاریان بۆ تاقیکاری بۆ دۆزیەوە. نیزیکەی چوار پێنج مانگ لەوێ کاری کرد کارێکی سەختو دژوار، ئەویش

سەعاتی بە ١٧ کرۆن! لەبەر ئەوەی ئەو جێگایە ئوتوبوسی بۆ نەدەچوو، بە دووچەرخەش دوور بوو، دەبوایە هەموو بەیانیان بە ماشێن بیگەیەنمە ئەوێو ئێواران بچم بیهێنمەوە. ئەوەی وەریدەگرت سەری مانگ سوسیال لە یارمەتیەکەی کەم دەکردینەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی زارا پێیخۆش بوو کار بکات، من دەنگم نەدەکرد. جارو بار پێمدەکوت منو تۆ هەر حەمباڵیمان بۆدەمێنێتەوە. لەوەڵامدا دەیگوت زۆر عەیبە مرۆڤ لیرە بژی و کار نەکات.

زۆری گوشار بۆ من دێنا کارێك بکەم. بۆ منیش کارێکی پڕاکتیکیان دیتەوە کە ماوەی مانگێك لەو شیرکەتەی لێیبووم دەچووم ماڵی خەڵکمان دەگوێزتەوە. کارێکی زۆر سەخت بوو، بەڵام دوای مانگێك پڕاکتیك پێیان گوتم ئێمە کارمان نییە. ئیتر دوای ئەو کارە قورس و بێ ئاکامە هەرچی بۆیان دوزیبامەوە نەدەچووم.

زارا کە بێکار دەبوو زۆر وەڕەز دەبوو. کلاسێکی دیتبۆوە حەوتووی دوو ڕۆژ دەچوو زمانی دەخوێند. حەوتووی دوو ڕۆژیش لەگەڵ ژنو مێردێك بەنێوی هۆکان وشەشتین، دەچوون یاریدەی نەخۆشو پیرەکانیان دەدا، بە نێوی کاری خێر (Frivilligt jobb). بێجگە لە وەش نیزیك بە دە دوازدە ساڵ بوو ببوو بە ئەندامی سەلیبی سوور. بێجگە لە حەقی ئەندامەتی ساڵانە دووسێ جاریشی پووڵ بۆ تێدەکردن. زۆر جاران پێیان دەگوت ئەوەندەی تێمەکە هەمووی بەولاو لادا دەدەن، لە وەڵام دا دەیگوت من بە نییەتی ناردن بۆخەڵکی لێقەوماوی ئەفریقای دەنێرم، کەیفی خۆیانە. ئەوەندەی تەبلیغات بۆ من کرد کە ببمە ئەندامی سەلیبی سوور، منیش لەبەر خاتری ئەو خۆم کردە ئەندام، کە کاغەزیان دەنارد یاریدەیان بدەین، سەری مانگ دەیدا بە مرادی کوڕمان بۆیان تێکا.

زارا لە هەر جێگایەك هەرچی دەست کەوتبایە هەمووی کۆ دەکردەوەو ساڵێ دوو سێ جار لەو شوێنەی کۆنە فرۆشی مێزێکی بەکرێ دەگرتو دەیفرۆشتو پووڵەکەی بۆئەو کەسانەی کە دەیزانیو پێی وابوو موحتاجن یا هەتیون دەیناردەوە کوردستان.

کچەکان و کوڕەکان زۆریان پی ناخۆش بوو کە دایکیان ئەو شت فرۆشتنە دەکا. زۆریان پێدەگوت وازی لێ بێنێ، هەر چەند ئەوان پێیان دەگوت تۆ هەرچەندی دەڵێی دەتدەینێ، بەڵام گوێی نەدەدانێ و بەو کارە دەستی خۆی ئاواڵە ڕادەگرت خێرو خێراتی خۆی بکا. پێی وابوو ئەگەر لەوان وەربگرێ خێرەکەی بۆخۆی نابێ. بە کورتی زۆری حەز لەو خێرو مەندکاریە بوو. ئەوەی ئەو لەو بارەوە دەیکرد، بێجگە لە من منداڵەکان هەستیان پێ نەدەکرد. زۆر جار کە من لەو بارەوە پشتیوانیم لێدەکرد منداڵەکان پێیان ناخۆش بوو. نەش دەکرا بۆیان لەبنی کەدووی بدەی و تێیان بگەیەنی کە لە ئەوەی بۆخۆی پەیدای دەکا لە گەڵ ئەوەی ئەگەر ئێوە بیدەنی جیاوازی هەیەو ئەوەی بەدەست و مستی خۆی پەیدای دەکات خێری پترە. هەر خێرێکی کردباشی دەیگوت خوایە سندوقی سەری منداڵو نەوەکانمبێ. دەمگوت زارا ئەدی من؟ پێدەکەنی جوابی نەدەدامەوە!

## ئاوات کۆتایی نایە

زۆر جاران پێکەوە کە لەگەڵ زارا دادەنیشتینو قسەمان لە داهاتووی خۆمانو مان و نەمان دەکرد، من پێمدەگوت ئەگەر من مردم پێمخۆشە لە گەڵ منداڵەکانو خزمان وابکەیو، واو وابێ. پێدەکەنی دەیگوت، ئەوەڵەن کەس نازانێ کێ لەپێش کێدا دەمرێ، جارێ وەختی مردنیش نییە، ساغو سەلیمین و زۆرمان

ئاواتو ئارەزوو ماوە. کە دەمپرسی ئاواتەکانت چین، سەردەمانێك باسی چوونە زانستگای منداڵەکان بوو. دوای ئەوەی زانستگایان تەواو کرد، ئەو جار دەیگوت پێم خۆشەماڵو حاڵیان ببینم ژن بێنن تێر لە شاییەکەیاندا سەرچۆپی بگرمو هەڵپەڕم. لە ماوەی سێ چوار ساڵدا کوڕەکان ژنیان هێناو شاییو گۆڤەندێکی باشیان کردو لە هەرسێکیاندا زارا سەرچۆپی دەگرتو تێر هەڵدەپەڕی.

ڕۆژێك لێم پرسی شوکر ئەوە ئاواتەکانت هاتنەدی، منداڵت خوێندیان، کاریان دیتەوەو بۆخۆیان ڕازین، ژنیان هێناو شاییانکرد، تۆش سەرچۆپیو داوەتی خۆت کرد. ئەوجار چ ئاواتێکت ماوە؟ بەو پرسیارەی من زۆر پێکەنیو گوتی بەڕاستی سەعید ئارەزوو کۆتایی نایە، یەك ئارەزووم ماوە پێمخۆشە ئەوێش بێتە جێ دوایە گوێم لێنییە بمرم. پێکەنیم پێمگوت تۆ **دەببە** بە خوا دەکەی، بڵێ بزانم ئەوجار چییە؟

گوتی پێم خۆشە نەوەی کوڕەکان ببینم، دەڵێن نەوەی کوڕ خۆشەویستە بزانم وایە، کوڕە سەعید ئەو مندالانەی شێواو و شیرنم ئەوەندە خۆش دەوێن حەددو حیسابی نییە. پێکەنی گوتی تۆ دەزانی هێشتا هیچ باسێك لە زگپڕیو نەوەی کوڕ نییە، دیاریم بۆکڕیون کە بوون بیان دەمێ. پرسیم چت بۆکڕیون، پێی نەکوتمو کوتی ئەگەر بوون دەزانی .

پێمگوت زارا ئەگەر ئەمن مردم ئەو دیاریانەت دابە نەوەکان لەباتی منیشیان ماچ بکەو پێیان بڵێ ئەوەش لە باتی باپیرتان. پێدەکەنیو دەیکوت نازانم تۆ بۆچی خۆت مراندوەو ئەمن زیندووم. من دەلیلم بۆ دێناوە کە ئەوەڵەن من شەش ساڵ لە تۆ گەورەترم، دوو، من قەلبم عەمەلکراوە، سێ، من دیسکم هەیە، چوار، من شەکرم هەیە . تۆ شوکور ساغ و سەلیمیو لەمنیش جحێڵتری. دوعای دەکرد نانا ئیشەڵڵا جارێ هیچت لێنایە.

بەڕاستی زارا هیچی نەبوو، ژنێکی ساغو سالم و بە ئێنێڕژی و توندو تۆڵ و گورج و گۆڵ بوو. ڕۆژی یەك دوو سەعات پیادەڕەوی دەکرد. نیزیك دە ساڵ بوو پێیان گوتبوو شەکرت هەیە، سەرە ڕای ئەوەی پارێزی نەدەکرد، ئێستاش پێویستی بە دەنکێك حەبی شەکر نەبوو لەبەر هەڵسووڕان و کارو پیادەڕەوی. کە چی لەپڕ ڕا تووشی دەردی بێدەرمانی سەرەتان بوو، هیچ داو دەرمانێکی لە فریا نەهات. ماوەی نیزیك مانگێك بۆ چارەسەری نەخۆشیەکەی لە نەخۆشخانە کەوتو حەوتووی دوو ڕۆژ دەهاتەوە ماڵێ، هەتا دەچووینە سەردانی، یا کە دەهاتەوە، هەموومانی ڕادەسپارد کە لای کەس نەڵێین زارا نەخۆشە. کە دەمانپرسی بۆ؟ لە جوابدا دەیکوت ناچار دەبن لەبەر ڕوودەربایستی بێنە سەردانم، خەڵك کاری هەیە با من نەبمە هۆی عەزابو ئازاردانی خەڵك. زۆرجار من درۆم بۆدەکردو دەمگوت، یان لەماڵ نییە، یان بەسەفەر چووە. تەنانەت برازاکەی هاتبووە نۆروێژ تەلەفونی کرد دێم سەرێکی پورم دەدەم، کە بە زارام گوت برازاکەت دەیەوێ بێ سەردانت بکا، زۆر نارەحەت بوو گوتی، با نەیەو ئەو خەمو پەژارەو خەبەری نەخۆشی من نەباتەوە. ناچار تەلەفونم بۆ کردو گوتم زارا لەسەفەرە کە هاتەوە یان ئێمە دێین یان ئاگادارت دەکەمەوە وەرە.

زارا زۆر زۆری ئازاردانی خەڵك پێناخۆش بوو. لەگەڵ ئەوەیدا ئاوات و ئارەزووی نەوەی کوڕ دیتنی بردە بن گڵ، بەمردنی ئەو ماڵی منیش خراپ بوو پشتم شکا. ئێستا کە ئەو بیرەوەریە کورتە بۆ تەسکینی دڵی خۆم دەنووسم. بەداخەوە وا زیاتر لە ساڵ و نیوێك تێدەپەڕی کۆچی دوایی کردووە. ئەگەر حەوتووی دووجار نەچمە سەر گۆڕەکەیو دەستێك لەکێلەکەی نەخشێنم،

لەبەر دڵ تەنگیان ئوقرە ناگرم. من بە بیری خۆم ئەوەندەی پێ قەرزدارم بە هیچ لەونێك ناتوانم تێی هەڵێنمەوە.
زۆرجار ڕووی تێدەکردم دەیکوت لە بیرت نەچێ دوای من وەك کابرای گۆرین پێم هەڵبڵێی و بڵێی:
"بازی سیروانی، لەدەستم دەرچووی قەدرم نەزانی!"
شتێکی دیکەی کە بۆم بۆتە ئامۆژگاریو لە بیرم ناچێ، ئاخر وەسیەتی زارایە کە لە کوێ بنێژرێت. بە کچەکانی شێواوو شیرن دەڵێ ڕۆڵە! پێم خۆشە لە گۆڕستانی سوئێدیانم بنێژن، چوونکە ئەوان پەنایان داوین خۆمو مێردو منداڵم لێرە بژین. وێڕای ئەوەی قەرزداری خەڵکی سوئێدم زۆریشیان سوپاس دەکەم.
زارا کەسێك بوو ئەمەگناس، مرۆڤ دۆست، دژی فیتنەو دووزمانی و قسە گێڕانەوە بوو. هەمیشە شتێکی کە لێی دەترسا، زمانی خەڵك بوو. لەو بارەوە زۆر نهێنی کاربوو، حەزی نەدەکرد قسەمان بێتەوە سەر.
هەزاران هەزار جار دروودو ڕەحمەت بۆ ڕووحانەتیو هیوادارم گیان و ڕووحی هەر شادو جێگای بەهەشتی بەرین بێ...

## وتەی مامۆستا مەلا عومەر عەسری

لە ڕێکەوتی دوازدەی گەلاوێژی ١٣٨٦ی هەتاویی لە نێو ئاپووڕەی هاوڕێیان‌و دۆستان‌و خزمان‌و هەروەها بنەماڵەکانی خۆماندا، دوو کچ و سێ کوڕو زاواو نەوەو خوارزاکان، کە لەڕێگای دوورو نزیك بۆ بەشداریی لە ناشتنی تەرمی هاوسەرمدا بەشدار بوون، هاوڕێی دێرینم مامۆستا مەلا عومەری عەسری، ئەو چەند بڕگەیەی لەسەر کلگۆی زارا خوێندەوە:

تۆبڵێی پاشی نەمان ژینێ بێ؟
بۆلەشی ساردەوە بوو تینێ بێ؟
تۆبڵێی ئەو خەوە هەستانی بێ؟
یانە ئەو قافڵە وەستانی بێ؟
مەرگە دێ و دوابە هەموو شت دێنێ،
هەموو ئاواتێ لەدڵ دەستێنێ

خوشك‌و برایانی هێژا! وا ئەم جارەش لەدەوری یەك کۆبووینەوە، هەتا تەرمی یەکێکی تر لە ئازیزانمان دوور لە خاك‌و ئاو و نیشتمانەکەی خۆمان (کوردستان) بەخاك بسپێرین.

مەرگی دوورە وڵاتی‌و لە تاراوگە سەرنانەوە بۆتە بەشێك لە چارەنووسی ئێمەی کورد. بەداخێکی زۆرگرانەوە ڕۆژی چوار شەممە ڕێکەوتی ١٠ی مانگی گەلاوێژی ساڵی ١٣٨٦ی هەتاوی خوشکە زارا... پاش دەیان ساڵ ئاوارەیی‌و دەربەدەری‌و تاڵی‌و سوێری ژیان‌و کوێرەوەری و خەم و پەژارەی دوورە وڵاتی بە تاوانی کوردایەتی، بە هۆی نەخۆشیەکی سەختی پڕ بەژانی بێدەرمانەوە، دڵە پڕ لە هیواو ئاواتەکەی لەلێدان کەوت‌و، بۆ هەتا هەتایە ماڵئاوایی لە خۆشەویستانی‌و کوردستانەکەی کرد.

کورد سەدان ساڵە لە پێناو ئاواتەکانیدا خەباتی کردووەو شەهیدی داوەو ماڵو نیشتمانی کاولو، سەروەتو سامانی بەتاڵان براوە، ئاوارەو هەڵوەدای هەندەران بووەو لەغوربەت سەری ناوەتەوە. کورد یەکێك لە گەلە هەرەکۆنو ڕەسەنەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەو خاوەنی مێژوویەکی خوێناوی پڕلەکارەساتو ڕووداوی ئەوەندە ناخۆشو دڵتەزێنە، کەم نەتەوەی تری سەر ئەم گۆی زەویە خێوی ئاوەها مێژوو ڕابردووێکە .

داگیرکەرانی کوردستانو دوژمنانی گەلەکەمان، بەدرێژایی مێژووی هاوبەشی ئەوانو ئێمە، بۆ تواندنەوە و لەناو بردنمانو بۆ سڕینەوەی کوردستان لەسەر نەخشەی جوغرافیایی جیهان ، لە هیچ چەشنە جینایەتێك خۆیان نەپاراستووە. بۆکوژانەوەو دامرکانی ئاگری شۆرشو ڕاپەڕینەکانی گەلی کوردستانو، بێهێزکردنی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازیخوازانەی کورد، پەنایان بردۆتە بەر هەمووکردەوەیەکی ناڕەواو دوورلە ویجدانی مرۆڤایەتیو، دژ بەیاساو پرنسیپە ناو نەتەوەییەکان. گشت داواو ویستێکی ڕەوای ئەو گەلەیان بەئاگرو ئاسن، کوشتاری بەکۆمەڵ، گرتنو لەبەند ئاخنین، ئەشکەنجەو ئێعدام، خاپورکردنی شارو شارۆچکەو گوندی کوردستانو، ڕاونانو وەدەرنانی خەڵکەکەی لەسەر ئاو وخاكو زێدی هەزاران ساڵەی باب باپیرانیانو، پەڕەوازەکردنیان بەهەندەراندا وەڵام داوەتەوە.

بۆ دژایەتیو دوژمنایەتی کوردو، پێشێلکردنی گشت مافێکی ڕەوای ئەوگەلە، جیاوازیەك لە نێوان داگیرکەرانی تورك، فارس، عەرەب، کافر، مسوڵمان، شیعە، سوننی، چەپو ڕاستا نییە.

تەنانەت حیزبو ڕێکخراوە ئۆپزیپۆنە بەناو دێموکڕاتو پێشکەوتووخوازەکانی نێو نەتەوە سەردەستەکانیش لایەنگری مافی کوردنین... داگیرکەرانی کوردستان، گەلێك جاران بۆ دژایەتی و دوژمنایەتی کوردو پوچەڵکردنەوەی دەست کەوتو سەرکەوتنەکانیان دەستیان لە دوژمنایەتی و ناکۆکیە کۆنو لەمێژینەکانی نێوان خۆیان هەڵگرتووەو پێکەوە ڕێککەوتوون، زۆر پەیمانی چوکەو گەورەیان بەدزیو ئاشکرا دژ بە کوردو کوردستان بەستووە.

هەر ئێستاو لە باشووری کوردستان ، پاش دەیان ساڵ خەباتی سەختو خوێناوی لە دژی دڕو هارترین ڕێژیمی سەردەمو، دانی دەیان هەزارشەهید، ئەنفالو بەکۆمەڵ گۆڕکردنی ١٨٢ هەزار کەسی بێتاوان، لە ژن و پیاو، پیر و منداڵی سەربێشکە، بۆمبارانی شیمیاییو بەژار خنکاندنی پڕ بەشارێك خەڵكو، سووتانو کاول کردنی ٣-٤ هەزارشارو شارۆچکەو گوندی کوردستان. کورد خەریکە بەنەوایەك بگاتو لە چوارچێوەی عێڕاقدا بەشێك لە مافەکانی بە دەست بێنێ، دەبینین کە چۆن داگیرکەران و کەسایەتیو ڕێکخراوە شۆڤێنیستەکان، کەوتوونەتە خۆ. گشت پرنسیپە ئەخلاقی، ئینسانیو،
ئیسلامییەکانیان وەلاناوەو، دژبە کوردو دەستکەوتەکانی ڕێککەوتوون، پلان دەگێڕنو پڕوپاگەندە بڵاو دەکەنەوەو پەلاماریان دەدەن.

داگیرکەرانی کوردستان و دوژمنانی گەلەکەمان باش دەزانن کە کوردستان یەك وڵاتەو کورد یەك نەتەوەیەوخاوەنی یەك چارەنووسو خوازیاری یەك ئاواتە، واتە ڕزگاری یەکجاری گشت کوردستان. کە زۆر بەداخەوە ئێمە خۆمان، بە تایبەتی

کوردەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان ، تەنانەت لەو کاتو سەردەمە هەستیارە مێژوویەشدا، کە دنیا بەگشتی و رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەتایبەتی لە بەردەم ئاڵوگۆڕو وەرچەرخاندایەو، گومانیشی تێدا نییە کە هەر گۆڕانکارییەك لەناوچەکەدا، کەم تا زۆر کوردو کوردستانەکەشی دەگرێتەوە، هیچ ستراتیژیەکی نەتەوەیی، هیچ پلاتفورمێکی دیاریکراوی هاوبەشمان نییە بۆ دواڕۆژی کوردستانو کەمترین هاریکاریو لەیەکتر نیزیك بونەوەیەکیش لە گۆڕێدا نییە. هیوادارم کە ئەم هەلە مێژووییەش بەفیڕۆ نەچێتو کەڵکی پێویستی لێوەرگیرێتو...

بەڕێزان! ئەگەر چی ئاوارەییو دەربەدەری و کوێرەوەریو تاڵو سوێری ژیان و، ئەو گشت شکستو نشستە یەك لەدوای یەکانەی ئێمەی کوردی ئاوارەو سەرجەم نەتەوەکەمانی، وەها فێری خۆڕاگریو لەخۆ بوردوویی کردووە، وەهای بەبێبەشیو چارەڕەشی ڕاهێناوین کە کەم ڕووداوی ناخۆشو کارەساتی چاوەڕوان نەکراو دەتوانێ بمان لەرزێنێو ڕامان چڵەکێنێ، بەڵام دیسانیش مەرگی ئازیزان و لە دەستدانی خۆشەویستان، دەردێکی ئەوەندە گرانو برینێکی هێندە بەژانە، کە هەرگیز سارێژ نابێو جێگایان پڕنابێتەوەو لە بیر ناچێتەوە.
بۆیە من بە بۆنەی مەرگی ناوادەو کوتوپڕی خوشکی زۆر خۆشەویستمانەوە (براژنە زارا) شێرەژنی وڵاتپارێزی نەتەوەپەرستی چاونەترسی کورد، هاوسەرو هاوسەنگەری لە مێژینەی کاك سەعید، ڕەفێقی بەئەمەگو فیداکار و خۆڕاگری ڕۆژە سەختە دژوارەکانی ژیانیان، هاوبیرو هاندەری بۆ بەشداریکردنی چالاکانەو بێپسانەوەی لەخەباتو بزووتنەوەی ڕزگاریخوازانەی نەتەوەکەیدا (لە ناو ڕیزەکانی حیزبی دێموکڕاتی کوردستانی ئێراندا) لەقووڵایی دڵمەوە سەرە خۆشی

دەکەم لەبرای بەڕێزم کاك سەعید کاوە و منداڵەکانیو گشت خزمو کەسوکاری ئەو بنەماڵەیەو، خۆم بەشەریکی خەمو ئازارەکانیان دەزانم. هیوادارم ڕۆحی خوشکە زارای ئابادیخواە بە بەهەشت شاد بێتو، تەمەنی درێژی بۆ خۆشەویستان بەجێ هێشتبێو ئاخرین خەمیان بێت...

١٢ی گەلاوێژی ١٣٨٦ هەتاوی٣ / ٨ / ٢٠٠٧ ی زاینی
عومەری عەسری

دوابەدوای وتاری مامۆستا مەلا عومەر، برازای دڵسۆزو خۆشەویستم دوکتور شەماڵ کاوە کورتەیەکی لە ژیانی پڕلە دەردو خەم و دەربەدەری و ئاوارەیی زارای ئامۆژنی باس کردو گوتی:

## چەند وشەیەك سەبارەت بە ئامۆژنی زۆر خۆشەویستم زارا ئابادیخا

ژنان لە مێژووی جووڵانەوەی نەتەوەیی کورددا، هەمیشە غەدریان لێکراوە و ناو و خزمەتیان وەك سەربازێکی ونبوو کەوتۆتە پەراوێزی مێژووەوە. لە حاڵێکدا گرانایی و ئەرکێکی سەرەکی ئەو جووڵانەوەیە هەمیشە لە سەر شانی ئەوان بووە، ناوی ئەوان هەمیشە پاشکۆی ناوی پیاوەکان بووە. لە جووڵانەوەی نەتەوەیی کوردستاندا نموونەی ئەو چەشنە ژنە هەڵکەوتوو، ژیر و نیشتمانپەروەرانە کەم نەبوون و نین.

ئامۆژنە زارام یەکێ لەو ژنانە بوو کە بە هۆی ژن بوونی ناوی لە نووسراوەکان و کتێبەکاندا نەهاتووە، ئەگەرچی وەك

شێرەژنێکی هەڵکەوتوو، بوێر، نیشتمانپەروەر و خاوەنی بیر و هەڵوێستێکی کوردانە، یەکێ لەو کەسانە بووە کە بە درێژایی تەمەن و تا دوایین هەناسەی ژیانی بۆ کورد سووتا و لە هیچ هەوڵ و کۆششێك بۆ خزمەت بە نەتەوەکەی دریغی نەکرد.

ژیانی ئامۆژنە زارام، ئاوێنەی مێژوویەکی پڕ لە چەرمەسەری و ئاوارەیی و نەبوونی نەتەوەیەکە کە دوژمنان و نەیارانی بە درێژایی مێژوو، نکۆڵییان لە مافەکان و تەنانەت لە بوونی کردووە. ئاوێنەی هیوا و کابووسەکان، ئاوێنەی خەون و مۆتەکەکان و ئاوێنەی ئارەزووەکانی نەتەوەیەك بوو کە بە خەبات و تێکۆشان، بە کۆڵنەدان و بەبەرەکانی، بوونی خۆی بە نەیارانی خۆی سەلماندووە. بەڵێ، مێژووی ژیانی ئامۆژنم، مێژووی پسان و دابڕان، مێژووی خەونەکان و هەرەسی خەونەکان، مێژووی ئاوارەیی، دەربەدەری و چەرمەسەری و لە هەمان کاتیشدا، مێژووی خەبات و کۆڵنەدان بوو.

ئامۆژنم، زارا ئابادیخا لە چواری پووشپەڕیساڵی ١٣٢٤ لە گوندی ئاڵیاوێی شێخان لە بنەماڵەیەکی زەحمەتکێش و نیشتمانپەروەر لە دایك بووە. لە ساڵی ١٣٣٦ ژیانی هاوبەشی خۆی لە گەڵ مامم، سەعید کاوە، سەعید کوێستانی، دەست پێکرد. دوو ساڵ دوای ژیانی هاوبەش بە هۆی بارودۆخی سیاسی کوردستان ئاوارەی باشووری کوردستان بوون و جگە لە چەند کورتە ساڵێك، تەواوی ژیانی ئەو ژنە لە شاخ و داخەکانی کوردستان، لە نەداری، ئاوارەیی و شەڕدا تێپەڕ بوو. دواییش لە ساڵی ١٩٨٦، لە گەڵ هاوسەر و منداڵەکانی ئاوارەی هەندەران و وڵاتی سوئێد بوو و لەو شارە گیرساوە کە ئێستا ئێمە جەنازەکەی بە خاك ئەسپێرین.

من نامەوێ باسی مێهرەبانی و ڕووخۆشی و میوانداری یان باسی ئامۆژنم وەك دایك و وەك هاوسەرێکی باش بکەم. چونکو ئامۆژنم تەنیا هاوسەری مامم نەبوو، بەڵکو هەمیشە هاودەم، هاوسەنگەر، هاوبیر و هاوڕێی خۆشی و ناخۆشی ئەو بوو. ئامۆژنم تەنیا دایکێکی منداڵەکان نەبوو، بەڵکو مامۆستا و ڕێنوێن، دۆست و ڕەفیقی ئەوانیش بوو. نا، ئامۆژنم تەنیا ژنە کوردێکی نیشتمانپەروەر نەبوو، بەڵکو ژنێك بوو کە لە ڕووی ورە، بوێری و عەقڵی سیاسیی، لە ڕووی توانستی ڕیکخستن، کارگێڕیو، توانستی دیالۆگ و پێوەندە کۆمەڵایەتییەکان سەروبالایەك لە زۆربەی پیاو و کادرە سیاسییەکانی ئێمە بەرزتر بوو. ئامۆژنم بێگومان ئەگەر بە هۆی ژنبوون و ژیانی لە قۆناغێکی تایبەتی مێژوویيدا نەبوایە، شوێنی لە پاڵ کادر و سەرکردەیەکی سیاسی جووڵانەوەی کوردی ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا دەبوو.

بەڵام بە هۆی بارودۆخی ژنان لە جووڵانەوەی ئێمەدا، زۆربەی ئێمە زارا تەنیا وەك دایە زارا و وەك دایکی پێشمەرگە دەناسین. لە کاتێکدا زارا تەنیا دایکی پێشمەرگە نەبوو، بەڵکو خۆی پێشمەرگەیەك بوو کە دەورێکی سەرەکی لە سەر ژیانی سیاسی مامم‌دا و زۆر کەسی دەوروبەریدا هەبوو. هیچ کەسێکی تەنانەت ئەگەر جارێکیش ئامۆژنمی بینیبێ، ناتوانێ ئەو ژنە بەورە، دڵدەرەوە، کارگێڕ، ئاقڵ و بەبزە و ڕوو خۆشە لە بیر بکات.

بۆ من ئامۆژنم تەنیا ژنێکی تێکۆشەر و نیشتمانپەروەر نەبوو، بەڵکو کەسێك بوو کە وەك دۆستێك دەمتوانی قسە و دەردی دڵی

لە گەڵدا بکەم. وەك ژنێکی سیاسی و تێگەیشتوو باس و دیالۆگی سیاسی لەگەڵدا بکەم و شتی لێ فێر بم. ئامۆژنم لەو دەگمەن کەسانە بوو کە دەمتوانی لەگەڵیدا پێبکەنم و قاقا لێبدەم.
ڕوحی شاد و ناوی و یادی هەر زیندوو بێ.

شەماڵ کاوە
ئۆرەبروو ٣-٠٨-٢٠٠٧

## وتەی کاک حوسێن ئازەری

دوا بە بەدوای ئەوان هاوڕێ و زاوای خۆشەویستم حوسێنی ئازەری وێڕای دەربڕینی داخ و کەسەر، ئەو وتانەی خوارەوەی لەسەر گڵکۆی زارا خوێندەوە.

خۆشک و برایانی خۆشەویست!
ئازیزانی بەشدار لە کۆری ماتەمینی خوالێخۆشبوو خاتوو زارا ئابادیخا هاوسەری خۆشەویستی کاک سەعید کوێستانی، ئەندامانی بەرێزی لایەنە سیاسیەکانی کورد و کوردستانی، کەسایەتیە کۆمەڵایەتی و سیاسی و رۆشنبیرانی کوردستان، ئەندامان و پێشمەرگەکان و دۆستانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران!

من لە لایەن بنەماڵەی دایە زارا ئابادیخا، هیوادارم و ئاواتەخوازم، سوپاس و پێزانینی ئێمەتان کە لە قولایی دڵمانەوە دێ قەبوڵ بفەرموون و بەشداریتان لە کۆری خەم و پەژارەی لە دەسدانی خۆشەویستمان، لە سەر گلکۆی گوڵباران کراو بە ئالای کوردستان خەملاوی ئازیزمان، سەبوریمان دەداتێ و دەردەکانی دووری ئەو گەورە ژنەی کوردەواریەمان کەم دەکاتەوە.
دڵنیابن ئەو ساتانەی ئێوە لە لامان بوونە و دڵنەوایی ئێمەتان داوەتەوە، وێرای ئێمەی خەمبار و ڕەشپۆش و دڵبریندارى کۆچی بە ناوەخت و کوتوپڕی ئازیزی هەر کات دەم بەپێکەنین و سەرو ڕووخۆش و دڵفراوان و خەمخۆری هەمووان، شانتان داوەتە بەر تابووتی شێرە ژنێک کە هەموو ژیانی لە پێناو بەختەوەری و ئازادی و سەربەرزی نەتەوەکەی دا بەخت کردوە، قەت لە بیر ناکەین و ئەو دیمەنە کە ئەو ئازیزە لە سەر دەستی ئێوەی

بەرێز ، بە ناز و خۆشەویستیەوە بەرەو منزڵگای دوایین و ئەبەدی دەگوێزرێتەوە قەت لە ناخ و دەروونماندا ڕەش نابێتەوەو هەر کات دەبێتە مەڵحەمی دڵی بریندارو بە زاممان.
دایە خانمی من، نەنەی نەوەکان، باجە زارای زۆران، خوشکە زارای هەمووان، دایە گیانی شیواوو شیرین و دایکۆلەی مراد و ئازاد و فەرهاد، زارای کاک سەعید! هەستە بزانە، بڕوانە، ببینە ئەو خوشەویستانەی کە لە کاتی نەخۆشیتدا ڕادەسپاردین، پێیان نەڵەین با زەحمەت نەکێشن بێن بۆ لات، دەتگوت چوونکی کاریان هەیەو دەردیان هەیەو گرفتارن و تووشی ئازار و ئەزیەت دەبن ، بزانە چۆنت بۆ بەخەمن، چۆنت بۆ ڕەشپۆشن، چۆنت بۆ دڵبریندارن، چۆنت بۆ کۆچی بەپەلەت غەمبارن.
ئەوەتا یان ئێستا لێرەن، یان بەڕێوەن، یان لە ڕێگای دورەوە وڵام دەنێرن و تەلیفوون دەکەن و دەمان لاوێننەوە و ئەو ڕۆژانەمان دێنەوە بیر کە پێشمەرگە بوونە و ماندو و توونی و برسی، کۆلەبارت لێ وەرگرتوون و لات حەساونەوە و بۆ ڕزگاری گەلە بەش خوراوەکەمان پۆشتەت کردونەتەوە و قەوەتی دڵت داون و هیوا بە ڕزگاری و دواڕۆژت داونێ.
هاوڕێی ڕۆژانی سەختت، دەڵی: ٥٠ ساڵە لێی نزیک بوومە و ناسیومە و قەت بۆ جارێکیش ڕووی گرژم لێ نەدیوە، قەت شتێکی نەگوت وەدڵم کەوێ. دۆستەکەی دیکەی بنەماڵەمان دەڵی: ئینسانی گەورە هەر لە ڕەفتار و هەڵسوکەوتی دیارە. برادەر و خزم و دۆستی خۆشەویستت دەڵی: لە کارێزەی باشووری کوردستان، دزێک کە شارەکەی لە ئازار نابوو، لە نیوە شەودا، شێرانە و بوێرانە لە کاتێکدا کە بە تەنیا سەرپەرەستی منداڵەکانی دەکرد، خۆی لێدەگرێ و بە تەقەی دەمانچە، دز بریندار دەکا و دەست بەسەر تەحویلی خەڵکی دەدا. کوا ئەم ئەزیزانە ئەم کردەوانەی تۆ لەبیر دەکەن. ئاواتت بوو هەتا

ماوی بووک بۆ کوڕەکانت دابەزێنی، ئەمەشت زۆر کوردانەو بەداب و نەریتی کوردەواری گرت و کەواو پاتووڵت تەنانەت لە بەر فەرهادیش کرد و شیرینیت بە سەر بووک دا هەڵاویشت و بە ئالای سێ ڕەنگی کوردستان سەر چۆپیت بۆگرتن.

دەستە خوشکی دەورانی دەربەدەریت، هەناسە ساردو چاو بە فرمێسک دەڵی: زارا خاتوون هێندە ژنی چاک بوو، کەچکێکی شۆرباو هەبا بەشی جیرانەکانی دەنارد، قەت لە دەرو دراوسێ خافڵ نەبوو. کوا کەسی ئاوا بە ڕوحم وەک خوشکە زارا، لالایم گاتێ. ئەو دەستە خوشکەت کە دەتگووت لە سەفەری ستوکهۆلم لای دەحەسێمەوە، بە گریانەوە سەری بەڵێ ڕاستەی بۆ دەلەقێنێ.

ئامە گیانەکەت بە دەستە گوڵێک هاتووە بۆ لات، دەڵی، خاڵۆژن ئەم گوڵانەی زۆر خۆش دەویست.

کاک سەعیدی هاوسەرت بەڕواڵەت بەخۆ وەستاو، بەڵام فرمێسک لە چاودا تەزیو، دەڵی: زارا تۆ بەڕاستی نیشتمان پەروەرێکی گومنام بووی. تو بووی هاندەرم، تۆ بووی پاڵپشتی کار و چالاکیەکانم. تۆ سەربازی بێناو نیشانی کوردستان بووی. خودات لەگەڵ... لێرەدا دەنگی دەگۆڕێ و پێشی گریانی بۆ ناگیرێ.

دایەخانم گیان! بنەماڵەکەت، خزمان، دۆستان ماڵاوایت لێدەکەن و ئێوە بە یەزدانی گەورە دەسپێرین و بێشک جێگات هەر بەهەشتی بەرین دەبێ، ئاخر بەهەڵکەوت نێیە فرشتەکانی ئاسمانیش هەر ژمارە ٢٠ تیان بۆ ئارامگای ئەبەدیت هەڵبژاردوە.

بەڵی ئازیزانم! ئێمە بەحەق هەر چی بیکەین و بیڵەین بۆ ئەم دایکە نیشتمانپەروەرەمان زیادە بێژیمان نەکردوە. ئەمەی من سەری ئیوەم پێ هێشاند، تەنیا گۆشەیەکی زۆر

........................................................................................

بچووک بوو لە تابلۆی ژیانی ئەو دایکەمان کە بۆ سوکنایی دڵمان لە قەوارەی لاواندنەوەی سەر گڵکۆی پیرۆزی دا پێشکێشم کردن.

دوایین وەسیەتی بۆ کچان و کوڕانی دەوری تەختی نەخۆشخانەی، خۆشەویستی و یەکیەتی و ڕێزو حورمەت و دڵی یەکتری نەهێشاندن بوو، ئاخر بەحەق لە لەت بوون و دابڕانی ڕێبوارانی ڕێگای کوردایەتی بێزار بوو.

ڕوحی شاد و جێگای بەهەشتی بەرین بێ!

سوپاس بۆ هەموو لایەک.

حوسێن ئازەری

ئۆرەبروو ٣-٠٨-٢٠٠٧

## بیرەوەریەکی کورتی من لە سەر دایە خانم!

دیارە من هەر لە شاری نەغەدەوە، لەو کاتەوە کە دەورانی خوێندنی دەبیرستانم تێپەڕ دەکرد، کاک سەعید کوێستانیم ناسیوە. ئێستاش ئەو وێنەیەم لە بەر چاوە کاک سەعید کە وێنەگری ڕۆژنامە بوو، گرتبووی. وێنەکە منی لە کاتی گرتنەوەی تۆپدا نیشاندەدا و لە ڕۆژنامەدا بڵاوکرابۆوە. ئەو کات من گۆڵچی شاری نەغەدە بووم. کاک سادق کاوە کە برا گەورەی کاک سەعید بوو، نوێنەرایەتی ڕۆژنامەیەکی گەورەی ئێرانی لە شاری نەغەدە دەکرد و من کە چالاکوانی تۆپی پێ بووم، کردبووە هەواڵنێری ڕۆژنامەی وەرزشی و هەر بەم بۆنەشەوە من ئاگاداری بنەماڵەی کاک سەعید بووم. هەوەڵ جار کە چاوم بە دایە خانم کەوت، لە ماڵی خۆیان لە شاری نەغەدە بوو. ئەو کات کاک سەعید لە سەر خۆپیشاندانەکەی شەهید عەزیز یۆسفی لە شاری مەهاباد لە لایەن ساواکەوە کەوتبوە زیندان. من و چەند هاوڕێیەکی دیکە کە خوێندکاری زانکۆی تەورێز بوین، بە هۆی داخرانی زانکۆ گەڕابووینەوە نەغەدە و لە ڕێکخستن و ڕێبەری کردنی خۆپیشاندانەکانی ئەو سەردەمی شاری نەغەدە لە دژی حکومەتی شادا هەڵسور بووین، بۆ سەردانی بنەماڵەی کاک سەعید چووبووینە ماڵیان.

بڵێسەی ئاگری شورشی گەلانی ئێران دژی شاو دواتر خەباتی توند و خوێناوی گەلی کورد بۆ مافە ڕەواکانی خۆی لە کوردستانی ڕۆژهەڵات، وا منی بە خۆیەوە گرێدا و سەرقاڵ کرد کە ئیتر هەواڵ و خەبەری بنەماڵەی کاک سەعیدم هەر نەما.

چەند ساڵ دواتر واتە ساڵی ١٩٨٥ ئەو کاتەی کە من لە شارۆچکەی کارێزەی نزیک شاری سولەیمانی گیرسابوومەوە و سەر قاڵی دانانی دووکانی وێنەگری بووم، کاک سەعید، کە هەر

چاوەڕوانیم نەدەکرد، لە دەرگای دووکانەوە وەژور کەوت و سڵاوی کردو گوتی حوسێن خەریکی چی؟
من دەمزانی کاک سەعید وێنەگرێکی شارەزایەو کاتی خۆی دووکانی هەبووە. زۆرم پێخۆش بوو هاتبووە سەردانی دووکانەکەم. ئەو کات دووکانەکەم لە بەر ئەوەی کە شارەزایی زۆرم نەبوو، هێشتا وەڕی نەکەوتبوو. کاک سەعید هەر زوو هەستی کرد کە من شتێک فێربوومە بەڵام بە نیوە چڵی.
بۆیە خۆی بێ ئەوەی من داوای لێبکەم دەستی کرد بە ڕێنوێنیم و دروستکردنی شوێنی وێنەگرتن و زاهیر کردنی فیلم. یارمەتیەکانی کاک سەعید، کاریگەریەکی تەواویان هەبوو لە سەرکەوتنمدا. ئەوکات کاک سەعید بەهۆی نەخۆشی دیسکو دڵەوە، بە ئیجازەی حیزب هات و چۆی بەغدای دەکردو ماڵەکەی هێنابووە کارێزە.
بۆ سوپاس و قەدردانی کردن لە زەحمەتەکانی کاک سەعید، کرێکارەکەی دووکانم، کاک خدر کوڕی پورئامین کە خەڵکی کارێزە بوو، ڕاسپارد کە لە لای خزمەکانی خۆی قەلێکی باش و گەورە بکڕێ و بیباتە ماڵی کاک سەعید و سڵاوی منیان پێبگەینێ. زۆری پێنەچوو، ڕۆژێک مراد، کوری گەورەی کاک سەعید، کە ئەودەم منداڵیکی ١٢ ساڵانە بوو، هات بۆ دوکان و گوتی دایکم بۆ نانی نێوەڕۆ بانگی کردووی و دەڵێ دەبێ لە گەڵ هاورێکەت کاک سمایل ئەحمەدیان تەشریف بێنن.
بۆ نانخواردنی نیوەڕۆ من و کاک سمایل لە دەرگای ماڵی کاک سەعیدمان دا. شیرینی کچی کاک سەعید، کە هەوەل جار بوو دەمدیت دەرگای لێکردینەوە. من هەر ئەودەم دڵم راچڵەکی و خەبەری دا. ئەو هەوەڵ دیدارم ئێستاش هەر لەبەر چاوە.
ئەو ڕۆژە کە ئێمە بۆ شۆرباوی قەل لە ماڵی کاک سەعید میوانداری کراین، هەوەڵ جار بوو دوای دەرچوونمان لە شاری

نەغەدە، چاوم بە زارا خانم دەکەوتەوە. ئێمە چەند کاتژمێرێک لەوێ ماینەوە و میوانداریێکی باشیان لێکردین و کۆڵێکمان باسی شۆرش و ڕۆژگار و وڵات کرد.
من بەڕاستی هەتا ئەودەم کەمتر لە گەڵ ژنێکی وەک زارا خانم کەوتبوومە قسەو باس. وشیاری سیاسی و کۆمەڵایەتی و دابوو نەریتی کوردانەی بەلامەوە گەڵێک سەیر بوو. هەتا بڵەی میواندار و ڕووخۆش و بە ئێحترام بوو. لە ڕەفتار و هەڵسوکەوت و قسەکانیڕا دیار بوو ئەزموونێکی یەکجار زۆری لە ژیانی دەربەدەری و ژیانی پێشمەرگاندا هەبوو. زۆر ژنێکی کەیخوداو ساحەب بڕیار و بەدەستەڵاتم هاتە بەرچاو.
ئەمە سەرەتای ئاشنایەتی من بوو لە گەڵ دایە خانم دا. دوای ئەو کات من جارێکی دیکەش، ئەو کاتەی زارا خانم دزەکەی شارۆچکەی کارێزەی بە تەقەی دەمانچە بریندار کردو قۆڵبەست تەحویلی ڕدێنسپیەکانی کارێزەدا، سەردانم کردوە.
لەو سەرو بەندەدا باوکم بۆ سەردانی من هاتبوو بۆ کارێزە و سەردانی ماڵی کاک سەعیدیشی کرد. ئەمە بوو بە هاتووچۆی زیاتری من بۆ ماڵی کاک سەعیدو دیداری زۆرتری دایە خانم. چوونکی ژنێکی دونیا دیتوو و بە ئەزموون و بە مشوورو وریا بوو، لە دانیشتن لەلای تێر نەدەبووم. من قەت بۆ جارێکیش نەبووە لە مەجلیسی دایە خانم دا وەڕەز بووبم. بۆیە ئەو شوێنەی ئەوی لێبا، مەجلیسێکی گەرم و گوڕو دۆستانەو خۆشەویستانەو بە باس و ڕاو تەگبیر دەبوو.
هەر لەو سەردانەدا بوو، کە باوکم خوازبێنی شیرینی خێزانمی لە کاک سەعید و دایە خانم کرد.
دایە خانم گوتی ئەگەر کچ و کوڕ پێکڕازی بن من قسەم نیە، بەڵام با پەلە نەکەین، با ماوەیەک حوسێن هاتووچۆی ماڵی ئێمە بکا و لە گەڵ شیرین وێگڕا قسە بکەن و یەکتر باشتر

بناسن. لە دیداری ماڵی کاک سەعید، زارا خانم زۆر ئەمنی دەدواندو قسەی لێدەپرسیم و پێموایە هەڵیدەسەنگاندم. ئەو کات شەڕی پێشمەرگەکانی کۆمەڵەو حیزب لە ئارا دابوو. سەرەڕای ئەوەی زارا خانم دەیزانی من پێشتر پێشمەرگەی کۆمەڵە بوومە، قەت بە بێحورمەتی باسی پێشمەرگەی کۆمەڵەی نەدەکردو هەر دیکوت ئەم شەڕە خەسارێکی گەورەیە بۆ کوردستان و هەردووکی پێ کوڕی کورد بوون و دڵ نارەحەت و خەمبار بوو بەو شەڕە. من دواتر زانیمەوە کە کاک سەعید و دایە خانم لە سەر ڕەزامەندیان بە زەماوەندی من و شیرین، بە هۆی ئەوەوە کە من پێشتر کۆمەڵە ببووم و بنەماڵەی کاک سەعید و دایەخانم هەمیشە حیزبی بوونە، لە لایەن هێندێک کەسەوە کەوتبوونە بەر لۆمە و ڕەخنە، بەڵام قەت لە بڕیار و دروستی هەڵویستی خۆیان پاشگەز نەبوون.

دوای بەستنی پەیمانی هاوسەرایەتی من و شیرین، ئیتر ئێمە ببووینە یەک ماڵ و زۆرترین کاتەکان لای دایە خانم دەبووم و زۆر بەخۆشی گوێم دەدایە قسەو باسو پەندو نەسیحەتەکانی.

ژیانی هەموو سەرگوزەشتەی ڕۆژانی سەخت و تاقەت پروکێن بوون و پڕ بوون لە ئەزموونی باش و بە نرخی ژیانێکی شەرافەتمەندانە و سەربەرزانە.

ئەو کات کە لە کارێزەی کوردستانی باشوور بووین، دەمدیت کە قەت لە دراوسێیەکانی خافڵ نەبوو، بەتایبەت چاوی بە بنەماڵە فەقیرەکانەوە بوو. هەموو کاتی ئێواران و پێش نان خواردنی شەو، شیرینی خێزانم یان یەکێک لە کوڕەکانی بە قاپێ شۆرباو یان هەر خواردنێکی دیکەوە، دەنارد بۆ لای دەراوسێ فەقیرەکان. هەموو جێژنەیەک دەراوسێیەکانی دوورو نزیکی بە یارمەتی دان بەسەر دەکردەوە. دایە خانم کەسێکی توندی ئایینی نەبوو، بەڵام بڕوای بە خێرو خێرات و دەستگرتنی خەڵک

هەبوو. زۆریش لای گرینگ نەبوو کە ئەم کەسە حەتمەن موسوڵمان بێ. خۆی بە ئایین بە موسوڵمان دەزانی بەڵام ڕێزی بۆ دیانەتەکانی دیکەش یەکجار زۆر بوو.
لە هەر گەڕەکێک با، خەڵکەکە زۆر زوو دەیان ناسی و دەبوونە دۆستی و ڕێزو حورمەتیان دەگرت. لە نەسیحەتکردن و ڕێگای باش و دروست نیشاندان بە دەراوسێکان هەر ڕانەدەوەستا.
دایە خانم بەڕاست خاوەنی ڕوحێکی پاک و دڵێکی گەورە و دەروونێکی خاوێن و بیرێکی ئینسانی بوو. لەو مرۆڤانە بوو کە بۆ ساتێکیش لە خزمەت کردن و چاکە کردن و دەستگرتنی دەورو بەری خۆی خافڵ نەدەبوو.
دەرگای ماڵی هەمیشە بۆ میوانان ئاوەڵە بوو، کەم کاتیش بوو میوانی نەبێ. نەم بیستووە کەسێک میوانی بوبێ و تاریفی میوانداری و چێشت و دەسپوختی خۆشی دایە خانمی نەکردبێ و سوپاسی پێزانینی بۆ نەناردبێتەوە. هەر کات لە دەرگای حەسار وەژور کەوتبایەی، سەرەڕای بێ ئاوی و بێ کارەبایی شارۆچکەی کارێزە، چاوت بە ماڵێکی سادە و ساکار، بەڵام هەتا بڵەی پاک و خاوێن و ڕێک و پێک دەکەوت. تەنانەت بەردەرگای ماڵیشی لە گەڵ دراوسێیەکانی فەرقی هەبوو لە ئاست خاوێن ڕاگرتنیدا.
دایە خانم زۆریش ڕازی و قانع بوو، زۆری خەم بە ماڵی دونیاوە هەڵنەدەگرت، دەیگوت هەر ئەوەندەت هەبێ پێیبژی، دەنا قالب و لەش ساغ و بێ خەم بی. دەیگوت ماڵی دونیا باشە هەت بێ، کە باشی بگوزەرێنی و دەستی خەڵکی پێ بگری. هەتا بڵەی ژنێکی سەرو ڕووخۆش و بێ تەکەبوور و خاکی بوو.
هەتا ساڵی ١٩٨٦، من و شیرینی خێزانم، لە گەڵ ماڵی کاک سەعید لە کوردستانی باشوور ماینەوە و دواتر دەرفەتمان بۆ ڕەخسا و لە جەنگەی هێرشی هێزەکانی ئێران بۆ ناوچەی ماوەت

کوردستانمان بەرەو هەندەران بە جێهێشت، واتە هاتین بۆ وڵاتی سوئێد.

دایە خانم زۆر بەرامبەر بە خەڵکەکەی ئەو وڵاتە ئەمەگ ناس بوو، زۆری سوپاس دەکردن لە بەر ئەوەی پەنایان دابووین و دەستی ئێمەیان لە کاتی لێقەوماویدا گرتبوو. هانی هەموو ئەندامانی بنەماڵەی دەدا کە یان دەرس بخوینن یان ئەوەتا کار بکەن و سەربار نەبن. زۆر زوو دەرکی هەلومەرج و کولتوور و دابوو نەریتی وڵاتی سوئێدی کردو دەیزانی زۆر شتی لە گەڵ نەریتی کوردەواریدا نایەتەوە، هەربۆیە داوای لێدەکردین کە لەگەڵ کوڕان و کیژانی گەنج لە سەرەخۆ بین و بە ڕێنوێنی و دوواندن و بە لە سەرەخۆییەوە ڕێگای ڕاستیان لەو کۆمەڵگایەدا نیشان بدەین.

هاووشۆو دۆستایەتی بنەماڵە کوردەکانی بەگشتی زۆر پێخۆش بوو. هەموو دەورانی ژیانی لە سوئێد کە زیاتر لە ٢٠ ساڵ بوو، هەمیشە ئەندامی ڕێکخراوە گشتیەکان بووە و لە هەموو خۆشی و ناخۆشی کوردەکاندا وەک کەسێکی بە ئەزموون و جێگای ڕێزو حورمەت حازر و ئامادە بوو.

لە زۆربەی هەرە زۆری خۆپیشاندان و بۆنەکانی سوئید کە بۆ پشتیوانی لە ڕزگاری گەلی کورد دەکرا نەتەنیا خۆی بەشدار دەبوو بەڵکوو هاندەرێکی باش بوو بۆ بەشداری ئەندامانی بنەماڵەش.

بە ڕاشکاوی دەتووانم بڵێم هەرهەموو خوو و خدەی باشی ئینسانی لە دایە خانمدا مەوجوود بوو.

پاکوخاوێنی، دڵفرەوانی، ڕوح گەورەیی، لێبردوویی، بەخەم بوونی بۆ هەمووان و...

بەڕەحمەت بێ باوکم، حاجی مەحموود ئازەری، دایە خانمی زۆر خۆش دەویست و لە دانیشتن و مەجلیسی تێر نەدەبوو. باوکم

دەیگووت حوسێن، دایەخانم چرای هەمووماڵەکانە و ئاگای لە هەمووتانە و بە دەرد و خەمتانەوەیە و کۆڵەکەی ماڵەکانتانە. قەدری بزانن و ئاگاتان لێیبێ.
بەداخەوە کۆچی زوو و نابەوەختی دایە خانم هەموومانی لە دوونیایەک خەم و پەژارەی لە ڕادەبەدر نقووم کردو مەودای پێنەداین لەوە زیاتر لە دەریای بێ بنی مەحەبەتەکانی کەڵک وەرگرین. ڕوحی شاد بێ.

حوسێن ئازەری
٢٠٠٩٠١١٢

**نامەی کاک مەلا محەمەد خزری**

بە نامەی هاوڕێی بەڕێزم مەلا محەمەدی خزری، جیران و دۆستی ٤٠ ساڵەی من و زارا، کۆتایی بەم پەڕتووکە دێنم.

برای بەڕێز کاک سەعید!
ئێستا کە دەتهەوێ لەسەر داوای منداڵەکان وەک سەربەردە شتێک لە سەر خۆت و شادڕەوان براژنە زارا بنووسی زۆرم پێخۆشە. لەمێژ بوو چاوەڕوانیم دەکرد دەرفەتێکم بۆ برەخسێ، بتوانم لانیکەم بەنووسینی چەند دێڕێک، یادێک لەو گۆڕغەریبە لەخاکدا خەوتوو، لەیاددا زیندووە بکەمەوە و هەستی خۆم بە دەربڕینی چەند وشەی کورتی ئەوشێرە ژنە دامرکێنم.
چاوێکم پێداخشاند. دیارە خۆتان لەمن باشتر دەزانن، کە ئێوە چۆن لەسەردەمی لاویەتیدا دەگەڵ یەکتر ئاشنابوونەو، بڕیاری ژیانی هاوسەری و هاوژیانی پێکەوەتان داوە، بوونەتە ڕوحێکی لەدوو لەش دا. بەهۆی ئاشنا نەبوونی ئەوسەردەمە من ناچمە سەر وردەکاری ژیانی تایبەتی ئیوەو بۆم نیە لەو بارەیەدا

بدویم! بەڵام لەساڵی ١٣٤٢ هەتاویەوە کەدەبێتە ١٩٦٣ زایینی لەنزیکەوە، وەکوو هاوڕێو هاوخەبات و دۆستێکی نزیک و گیانی کە زۆرتری دەورانی دەربەدەری وچەرمەسەری یەکتری، دواتر لە وڵات و پاشان لە تاراوگە، وەک نزیکترین کەسانی دەرەوەی بنەماڵە، کەم و زۆر ئاگادارم لەسەر ژیانی ئێوە! جابۆیە بە بۆچوونی خۆم بەشی ئەو ماوەیە کە من لەسەری ئاگادارم وئێوە نووسیوتانە، لەمەڕ ژیانی ئەو شێرەژنەی کۆمەڵگای سوننەتی کوردەواری، لەوە کەمترە کە دەبوو نووسرابا!

هەروەک لەسەرەوە ئامارژەم پێداوە ڕاستە ئێوە هەردووکتان گیانێک بوون لە دوو لەش دا، بە ماڵاوایی کردنی ئەو کۆچە نابەوەختەی کە کردی، لە دۆست وهاوڕێیانی، هەمووی ئێمە بەجێ هێشت! بەشی هەرە زۆری زەین و دڵ ودەروونی تۆشی دەگەڵ خۆی برد. دەزانم کۆچی ئەو خوشکە بەڕێزەی بەمانای وشە، کە هاوسەری گیانی بەوەفای تۆ بوو، خوشکێکی خەمخۆرو دڵسوز، دۆست و هاوڕێی گیانی ئێمەش بوو. من وتوبای هاوسەرم، گەلێک بیرەوەری ژیانی ئەو شیرەژنەمان بۆ بەجێ ماوە، کە بۆتە داستانێکی نەنووسراو بۆمان، کە زۆربەی کاتی خۆمان بەو یادە نەنووسراوانە دەبەینە سەر. ڕوح زلی و سەرجەم خوو و خدە مرۆڤانەکەی ئەو شیرە ژنە لە یادێکی چەند دێڕی دا ناگونجێ، مێهرەبانی، دڵسۆزی، خەمخۆری، نەک تەنیا هەر بۆ کەسانی نزیک وبنەماڵەیی، بەڵکوو خەمخۆری هەموو کەسێک بوو کە، تووشی گرفت و کارەساتێک دەبوون، خەمی ئەوانیشی بەکوڵی دڵ هەڵدەگرت!

نازانم لە کوێڕا دەست پێبکەم، لە ڕێزو حورمەت گرتنی هاوڕێ و دۆستەکانی، لە ژیانی دراوسێتی دەگەڵ دراوسێیەکانی، لە پەروەردەو پێگەیاندنی منداڵەکانی، دەگەڵ هەموو ژیانی نالەباری دەستکورتی ئەو سەردەمانەی کە دوورەوڵات بووین،

لە ئاوڕدانەوە لە کەسانی دەستکورت ونەدار! ئەگەر بێتوو تەنیا زاکون و بەدەماری ئەو شێرەژنە، بنووسرێ خۆی داستانێکی دوورو درێژی بەچێژە کە لەگەڕانەوە نایە!

لەبیرمە، زستانی ساڵی ۱۳٤۲ی هەتاوی، لە زینوێی شێخی بووین، ئەو دەمە بوو کە تۆ، چووبووی بۆ لای دەفتەری سیاسی، براژنە زار، دەگەڵ شێواو، هێشتا لەیەکێک لە ئۆدەکانی قوتابخانەکەی زینوێ دابوون. ڕۆژێک "قەیماسخانی فەڕەنگی" [١] قاپێک نیسک و قاپیک ڕۆنی نەباتی، بۆ برد کە بیکاتە کاسە جێژنە! لەبەردەرگا ڕاوەستا، لە دەرگاکەیدا، براژنە زارا ڕوحی شاد، دەرگاکەی کردەوە، زۆر بە ڕوو خۆشی خوڵقی قەیماسی کرد: فەرموو کاکە!

قەیماس: سوپاس براژن، ئەو ڕۆن و نیسکەم بۆ هێناوی!

گوتی زۆر سوپاس کاکە! دڵت بە خێزانی سەعید کویستانی سووتاوە، کە هاوسەرەکەی لەماڵ نیە، ڕەنگبێ لەبواری ژیان و بەڕێچوونەوە لە تەنگانەدا بژین؟ تۆ پێشمەرگەی ڕێزی تایبەتت هەیە هیچ بەتۆ ناڵێم؛ بەڵام بەئاغاکەت بڵی! ئێمە ئەگەر لە ئەسپ کەوتووین لە حەسڵ نەکەوتووین! چاو ببڕینە کیسەو مەنجەڵی...

یەکەم ئێمە هیچ کەموو کوڕیەکی وامان نیە کە دژمنمان پێخۆش بێ! دووهەم ئەگەر خوای نەخواستە، ڕۆژێک لەڕۆژان، لەژوورەکەماندا لەبرسانیش بمرین؛ دیسان چاو نابڕینە مەنجەڵی نامەردان و بە خواردەمەنی ئەوان درێژە بەژیان نادەین!

ئیتر لەو ڕۆژەوە من بە نەفس زلی و ویقارو ڕێزو گەورەیی ئەو شێرەژنە ئاشنا بووم. ئەوەم هەرگیز لەیاد ناچێ کە ژنێکی وەها کەم تەمەن، پەروەردەی کۆمەڵگای سوننەتی کوردەواری؛ لەو هەلومەرجە ناگوارەو هەژاریەدا کە لێرەدا جێگای نیە باسی

لێوە بکرێ؛ بەزمانێکی ئەوەند ڕێزوحورمەتەوە لە هەمان کاتدا بەماناو ڕاشکاوانە، تەرەف بدوێنێ و پەیام بدات بە کەسێک کە ڕێزو حورمەتی شیاوی لە هاوسەرەکەی نەگرتوەو پێچەوانەی عورف وئەخلاقی مرۆڤانە هەڵسوکەوتی دەگەڵ کردوە؛ بەڕاستی جیگای دەستخۆشانەو ئافەرین بوو، جۆرێک تەرەفی بەزمانی شیرین بدوێنی، و لەهەمان کات دا کوردە گوتەنی "تاڵاوی بەلا لغاوەی دا بێتەخوار"!

جگەرگۆشەکان! شێواو، شیرن، مراد، ئازاد و فەرهاد!
هەروەک گوترا گەلێ بیرەوەری خۆشم لەو زیندوو یادە هەیە، کە لەکورتە نامەیەکدا ناگونجێن. گەرەکم نیە دڵی کولی ئێوەو نزیکانی بنەماڵە بکولێنمەوە و وەژان بێنم. هیوادارم کە هەمیشە شانازی بکەن بەو دایکە وەفادارەی کە ئێوەی پێگەیاند، مامۆستایانە پەروەردەی کردن؛ وەک مێعمارێکی لێزان ماڵ وژیانی بۆهەمووتان پێکەوەنا، لێپرساوانە و سەربەرزانە، دابینی کردن ، ڕێنوێنێ ڕیگای ژیانی مرۆڤانەی کردن!
هەرگیز ئەو ڕۆژە لەیادم ناچێ، کە تەرمی پیرۆزی تەسلیمی خاک دەکرا، کە چۆن لە هەموو گۆشەو بێجاڕی وڵاتێکی تاراوگەی وەک سوئێد، لە شارە جۆربەجۆرەکانی ئەم وڵاتە دوور کەوتەیە ڕا، ئاپۆڕای جەماوەر، ژن و پیاو، بەدڵی پڕ لەپەژارەو چاوی فرمێسکاوی، مەلەیان دەکرد بۆ شان دانە بن تابووتی تەرمی پیرۆزی، بەخەمو پەژارەیەکی فرەوە هاوبەشی پرسەکەیان کرد.
چارەنووسی هەموو ژیانێک مەرگ و نەمانە و، مەرگ لەهەر تەمەنو ساڵێک دابێ ناخۆشە. دیارە مەرگی دایک ئەوپەڕیەتی بۆمنداڵ، چوونکە منداڵ لەهەر تەمەن و ساڵێک دابێ، بە لەدەست دانی دایک خۆی بەهەتیو دەزانێ! بەڵام چ مەرگێک لەوە جوان ترە کە، لە کاتی ماڵئاوایی و کۆچکردندا خەڵکی

ئاسایی، دەروجیران، دوورو نزیک، بەئەندازەی جگەرگۆشەکانی بۆی لەخەم و پەژارە دابن؟
شک لەوەدانیە هەرگا، گەنج و لاوێکی بەهەستی کورد، ئەوانەی ڕۆژێ لەڕۆژان ڕێگایان دەکەوێتە نزیک ئەو شوێنەی مەنزڵگەی ئەو هەمیشە پێشمەرگەیە و بەو شوێنەدا ڕادەبرن، بەئاماژە مەزارگەی پیرۆزی پێشانی یەکتر دەدەن:
ئەوە مەزارگەی ئەو شێرەژنە پێشمەرگە گۆڕغەریبەیە کە بەدرێژایی تەمەنی گەنجیو لاویەتی خۆی، گەلێک ڕەنج و کوێرەوەری نامرادی، لە پێناو ئازادی و بەختیاری نەتەوە تووک لێکراوەکەیدا کێشا، گەلێک چیاوچۆل و دۆڵ ودەرەکانی کوردستانی بە برسێتی و هەژاری ونەداری و... بە پێ پێوا!
ئاخ مخابن؛ داگیرکەرانی زۆردار، تەنانەت بستە هەردێکی خاکی نیشتیمانەکەشیان پێڕەوا نەدیت کە، هەموو تەمەن و ژیانی خۆی لە پێناودا بەخت کرد، ئێستا لە تاراوگە، لێرەدا مزڵی گرتوە!
بەویژدانێکی ڕەحەت وئاسودەوە بنوو، خەوی خیرت بێ!

موحەمەد خزری
سوئێد، ستۆکۆڵم، ٢٠٠٨/١٠/١٣

١) قەیماس خانی فەرەنگی . چەکدارێکی ئەحمەد تۆفیق بوو.

بە چەند وێنەیەک لە ئاڵبۆمی کۆکراوەی زارا لێرەدا
وەک یاد و بیرەوەری هەمیشە کتێبەکە کۆتایی پێدێنم.

## ماڵ ئاوایی !

وەرن یاران بکەن شینم کە یارم ڕۆیی یەکجاری
لە دوای کۆچی بەجێ ما بۆم غەمو دەردو گرفتاری
نەمێنم بۆتۆ ئەی یاری وەفاداری زەجر دیتوو
لە پاشی تۆ ئەمن چ بکەم بەغەیری ناڵەو زاری
شەوو ڕۆژێ دەسووتێم من لە دەردی دووریی ئازیزم
بەگوڕ دەگریم و فرمێسکیش لە دووچاوم دەباری
لە دنیادا وێگڕا نەماندیت بزەو خۆشی بە داخم
لەدنیای دی ئەگەر ڕا بووین دەبێ ڕێبێ بۆدڵداری؟
بەڕۆیینت لە دووریی تۆ شکا پشتم بڕا جەرگم
سەرم شێواوە نازانم پەنا بۆکوێ خودای باری
پەنا بردن شوکرکردن دوعا خوێندن نەما نەیکەم
بەفریادم نەهات ئەفسووس ئومێدم پچڕا یەکجاری
کەوابوو من دەبێ چی بکەم خوداوەندی هەموودنیا
دەبێ شینگێڕی یارم بم بچێژم دەرد و بیماری
تۆخوا بمبوورە نەم توانی بکەم دەرمانی دەردی تۆ
زەجرکێش بووی هەتا ماوم دەچێژم دەردی غەمباری
سەفەر خێربێ کە ڕۆیشتی خودا حافیز وەفادارم
بەدوات دا دێم منیش دوای تۆ ئەتۆلە دڵیمندا دیاری

..........................................





ئەم هەڵبەستە لە سێهەمین ڕۆژی دوای کۆچی زارا هۆنراوە : سەعید .



وێنەیەکی زارا بە جلی ڕۆژانە




لە دەستگیری ساڵی ١٣٣٨ی هەتاوی، ١٩٥٩ی زایینی ئەندامانی حدکا، دەربازبووم و بووم بە پەنابەری سیاسی لە عێراق. ئەو وێنەیە ژیانی پەنابەری من لە عێراق ساڵی ١٩٦٠ نیشان دەدا



وێنەی شێواو و دایکی لە حەوشەی خۆمان لە نەغەدە



زارا و جەلیلی برای، ساڵی ١٣٤١



زارا و منداڵەکان لەگەڵ برا گەورەی زارا کە نێوی ڕەحیم بوو




من و کاکم سادق کاوە، ساڵی ۱۹۷۲



وێنەی زارا لەگەڵ جگەرگۆشەکان مراد و ئازاد



دەریای هەیدەرئاباد لەگەڵ من و زارا، شێواو، شیرین، موراد و ئازاد. جارێ لە فەرهاد هەواڵێک نیە.



چوونە سەیران لە دەوروبەری نەغەدە




نەنە حەلیمە، زارا، شیرین و سەعید. ساڵی ۱۳۵۷



من و زارا، شێواو، شیرین، موراد و ئازاد، کاتی پێگەیشتنی گێلاسە و چوینەتە شاری شنۆ بە سەیران



زارا لە کاتی مانگا دۆشیندا لە گوندی وەردێ، ساڵی ١٩٨٢
ئەو منداڵە چالاکە، کوڕی عەزیزی خوارزام



وێنەی کاکم و براژنم و بنەماڵەکەی و عوسمانی خوشکم



وێنەی من و زارا لە دەشتی قەڵادزێ، ساڵی ١٩٨٤



دوایین وێنەمان لە کارێزەی کوردستانی باشوور، پێش ڕۆیشتنمان بۆ سوئێد. ساڵی ١٩٨٦ لە ڕاست بۆ چەپ: حوسێن ئازەری، ئازاد، شیرین، فەرهاد، زارا، موراد و سەعید



جێژنی لە دایک بوونی فەرهاد و دایکی کادۆی دەداتێ



جێژنی لە دایک بوونی شەپۆل (کوڕە گەورەی شێواو)، زارا کادۆی دەداتێ و پیرۆزبایی لێدەکا




ئاگرین لە نێوان دایکی شیرین و زارا دا بە جلی کوردی لە ڕۆژی دووهەمین ساڵڕۆژی لە دایک بوونی دا



شیرین لە نێوان من و زارا و شێواو، لەو ڕۆژە دیپلۆمی وەرگرت



ساڵی ١٩٩٢ ڕۆژی دیپلۆم وەرگرتنی ئازاد و موراد، زارا گوڵی لە مل کردوون و لە نێوانیان ڕاوەستاوە



ڕۆژی لە دایک بوونی ئەسرینە، زارا کادۆی دەداتێ و ماچی دەکا



زارا بە ماندوویش هەر نانی گەرمی بۆ دەکردین



وێنەیەکی تری زارا لە کاتی نان کردن دا



زارا و نەوەکەمان ئاگرین لە پارکی شاری ئۆرەبروو



شەپۆل و نەنکی، وێنەی یادگاری



شەماڵ، نەنە و باپیرە




ئەوین، نەنە و باپیرە



ئەسیرن، کچی شیرین، نەنکی پیرۆزبایی دیپلۆمەکەی لێدەکا




موراد و زارا لە سەفەری یونان ساڵی ٢٠٠٥



ئازاد و زارا هەر هەمان ساڵ لە یونان



فەرهاد و دایکی لە سەفەری یونان، ساڵی ٢٠٠٥



زارا لە کاتی کێک بڕیندا لە ساڵڕۆژی ٥٠ ساڵەی خۆیدا



شایی کەژاڵ و موراد، ئۆکتۆبری ٢٠٠٣



شایی ئازاد و بەفرین، ساڵی ٢٠٠٤

نەشمیلی برازام، ئازاد، بەفرین و زارا



ڕەسوڵ محەمەدی، ئازاد، بەفرین، زارا و ئامین



مارەکردنی کوردستان و فەرهاد،ساڵی ٢٠٠٦



لە ڕاستەوە: محەمەد ئەرمەغان، شێواوی هاوسەری، شیرین لەگەڵ حوسێنی هاوسەری، من و زاراش دانیشتووین



کەژاڵ و موراد، بەفرین و ئازاد، کوردستان و فەرهاد، من و زارا



زارا لە نێوان شیرین و شێواو



پێکەنینی شیرین، من و زارای تاساندوە



هاوین لە سەوزیخانەی خۆمان و قەرەڵوو خواردن

شێواو، زارا، شیرین، حوسێن و ئەسرین



حەسانەوەو خەوێکی خۆش لەسەر ڕانی زارا



فەرهاد، موراد، ئازاد، بەفرین، زارا و من لە یونان




من و زارا و کوڕەکان لە یونان،ساڵی ٢٠٠٥



من و زارا، فەرهاد و بوکەکان کەژاڵ و بەفرین



ئازاد و دایکی، خۆشترین چرکەکانی ژیان



سەرجەمی بنەماڵە لە ڕاستەوە بۆ چەپ:
موراد، شێواو، ئازاد، شیرین، فەرهاد و من و زارا



سەردانی مەلا محەمەد خزری و باجە توبا و وێنەیەکی یادگاری



دوايين ديدارى من و زارا لەگەڵ
كاك كەريم حيسامى لە نەخۆشخانە



ديدار زارا لەگەڵ دايک و بابى شەهيد عەبدوڵڵا قادرى ئازەر

## پێرست

## ئەو بەرهەمانەی تا ئێستا چاپو بڵاوکراونەوە

| | |
|---|---|
| ١. بەرەو قەندیل | بۆ منداڵان |
| ٢. گەشتو پرسیار | بۆ منداڵان |
| ٣. کۆڕی یەکگرتنەوە | ڕووداوی مێژوویی بە شێوەی تەنز |
| ٤. بەربەرەکانی | کۆمەڵایەتی |
| ٥. هەڵگورد پێشمەرگەیە | تابڵۆی لاوێکی کورد |
| ٦. دیاری و هەڵبەست | وێنەو هەڵبەست بۆ منداڵان |
| ٧. لەهەر شتێ مشتێ | کۆمەڵە چیرۆکێك لە ڕووداوی سەردەم |
| ٨. ژوان | کورتە ڕومان |
| ٩. ئاوڕێك – بەرگی ١ | بیرەوەری بەسەرهاتی سیاسی |
| ١٠. ئاوڕێك – بەرگی ٢ | بیرەوەری بەسەرهاتی سیاسی |
| ١١. ئاوڕێك – بەرگی ٣ | ڕووداوی پازدەمانگی نەتەوەیەکی ژێردەست |
| ١٢. وەردانەوە | کورت کراوەی ٨٦٣ لاپەڕەی بەرگی ١ و ٢ و ٣ی ئاوڕێك |
| ١٣. من و زارا | ئەم کتێبەی ئێستا لەبەر دەستتان دایە |

## ئەو نووسراوانەی تا ئێستا بڵاو نەکراونەوە

| | |
|---|---|
| ١. چێمەن و چالاك | کورتە رومان چاپ نەکراوە |
| ٢. ڕەو ڕەوەی مێدیا | سلسلە مەقالاتی بڵاو نەکراوە |
| ٣. بەستەو نیگار | بە وێنەی ڕەنگی بۆ منداڵان |

